حکومەتا هەرێما کوردستانێ - عیراق
وەزارەتا پەروەردێ
رێڤەبەریا گشتی یا پرۆگرام و چاپەمەنییا

# کۆمپیوتەر

## مایکرۆسۆفت وورد و ئینتەرنێت

## بۆ پۆلا هەشتێ بنەرەت

**دانان**
**لیژنەیەک ژ وەزارەتا پەروەردێ**

**وەرگێران**
لیژنەیەکێ ژرێڤەبەریا گشتی یا پەروەردا دهۆکێ ژ زارێ کرمانجیا خوارێ کریە کرمانجیا ژووری
پێداچوون (راستڤەکرن) سگڤان حسن علی / سەرپەرشیارێ بسپورێ کۆمپیۆتەری/پ. دهوك

چاپا شەشێ ٢٧١٥ کوردی ٢٠١٥ زایینی ١٤٣٦ مشەختی

# پشکا ئێکێ

## مایکرۆسۆفت وورد Microsoft Word

کۆمپانیا مایکرۆسۆفت ئێکە ژبەرنیاسترین کۆمپانییێن جیهانێ ، کۆ داهینەرا گەلەك پرۆگرامێن کۆمپیۆتەرییە کو لدویڤ سیستەمێ ویندۆزیدا کار دکەن .

مایکرۆسۆفت ئۆفیس (Microsoft Office) گرۆپەکە ژ پرۆگرامێن جێبەجێکرنا کاری ، وئێك ژڤان پرۆگرامان پرۆگرامێ مایکرۆسۆفت وورد (Microsoft Word) ە .

پرۆگرامێ مایکرۆسۆفت وورد ل سەرانسەری جیهانێ پرۆگرامەکێ تایبەتە ب نڤێسینێڤە، کو د ناڤدا نڤیسین ب هەمی جۆراڤە ودانانا وێنا وشێوێن جۆرا وجۆر و بۆ دورستکرنا خشتان دهێتە بکار ئینان .

## چاوانیا ڤەکرنا پرۆگرامی

١- کلیککرن لسەر Start.

٢- کلیککرن لسەر All Programs

٣- کلیککرن لسەر Microsot Word

Start→All programs→Microsoft Word

یان

Start→All programs→Microsoft Office→Microsoft Word

# پێکهاتێن سەرەکی یێن پرۆگرامێ مایکرۆسۆفت وورد




## ١) Title Bar شەریتا ناڤ ونیشان




## ٢) Menu Bar شەریتا لیستان




## ٣) Standard Toolbar شەریتا کەرەستێن ستاندەرد




## ٤) Formatting Toolbar شەریتا کەرستێن گونجاندنێ




## ٥) Task Pane تاسک پەین (بەشێ ئەرکان).

## ٦) Drawing Toolbar شەریتا کەرەستێن وێنەکێشانێ



## ٧) Status Toolbar شەریتا بارێ نوکە



## چـاوانيا نڤيســينىٚ د پـرۆگرامـىٚ ( مايكرۆسۆفت وورد )دا

### ١.ب ئينگليزى :

بۆ گوهۆڕينا جۆرىٚ نڤێسينىٚ ژ عەرەبى بۆ ئينگليزى دىٚ لسەر كيبۆردى( Ctrl +Shift) يان (Alt + Shift) يا لايىٚ چەپىٚ يىٚ كيبۆردى لێدەين يان لسەر شەريتا (Task Bar) دىٚ ئايكۆنىٚ (Ar) كەينە (En) و دناڤ جۆرێن فونتاندا دىٚ فونتەكىٚ ئينگليزى هەلبژێرين وەك :

Times New Roman

ودىٚ دەست ب نڤێسينا خۆ كەين لسەر كيبۆردى ب پيتێن ئينگليزى وپيتێن مە دىٚ بچووك (Small) هێنە نڤێسين ، لىٚ ئەگەر دوگما (Caps Lock) ئەكتيڤ بكەين پيتێن مە دىٚ ب شێوىٚ مەزن (Capital) هێنە نڤێسين ب رێكەكا دى ئەگەر دوگما (Caps Lock) ئەكتيڤ نەبيت دىٚ دوگما (Shift) بكارئينين دگەل هەر پيتەكا مە بڤێت ب شێوىٚ مەزن بهێتە نڤيسين.

### ٢.ب عەرەبى وكوردى :

بۆ گوهۆڕينا جۆرىٚ نڤێسينىٚ ژ ئينگليزى بۆ عەرەبى دىٚ لسەر كيبۆردى ( Ctrl +Shift) يان (Alt +Shift) يا لايىٚ راستىٚ يىٚ كيبۆردى لێدەين يان لسەر شەريتا (Task Bar) ئايكۆنىٚ (En) دىٚ كەينە (Ar)، ول جۆرێن فونتان فونتەكىٚ عەرەبى دىٚ هەلبژێرين وەك :-

Ali_A_Jiddah , Ali_A_Samik .......

لێ بۆ نڤیسینێ ب زمانێ کوردی ل جۆرێن فونتان دڤێت فونتەکێ کوردی هەلبژێرین وەك :

Ali_K_Jiddah , Ali_K_Samik , Zanest Govar

**لدووڤدا مفا ژ پیتێن عەرەبی یێن لسەر کیبۆردی دهێنە وەرگرتن بۆ نڤیسینێ ب زمانێ کوردی بتنێ چەند پیتەك نەبن ژبەر گۆهۆڕانکاریەك لسەر وان دهێت وبڤی شێوەی:-**

| پیتا سەر کیبۆردی | پیت ب کوردی |
|---|---|
| ث | پ |
| ض | چ |
| ط | گ |
| ظ | ڤ |
| ؤ | ۆ |
| ء | و |
| ذ | ژ |
| ة | ە |

**تێبینی:-**

١. Shift +K = بۆ بێهنوك (فاریزی )

٢. Shift +Q = بۆ نڤێسینا حەفتێ لسەر پیتێ

٣. Shift +A = بۆ نڤێسینا حەفتێ لژێر (بن) پیتێ

٤. Del = بۆ خالێ یان کۆمەدانانێ

٥. Shift+لا = لآ

# شەریتا کەرەستێن گونجاندنێ Formatting Toolbar




| | |
|---|---|
| بۆ گۆهورینا جۆرێ فونتێ نڤیسینێ دهێتە بکارئینان | Zanest _ Govar |
| ئەڤ ئایکۆنە بەرپرسە ژ مەزنکرن وبچووککرنا نڤیسینێ | 19 |
| بۆ گوهۆڕینا زمانێ نڤیسینێ | AR |
| دهێتە بکارئینان بۆ تۆخکرنا نڤیسینێ | B |
| دهێتە بکارئینان بۆ نڤیسینێ ب شێوێ ئیتالی (خوار) | I |
| دهێتە بکارئینان بۆ دانانا هێلەکێ لبن نڤیسینێ | U |
| دهێتە بکارئینان بۆ گوهۆڕینا ئاراستێ رستێ بۆ لایێ چەپێ یێ بەرپەڕی | |
| دهێتە بکارئینان بۆ گوهۆڕینا ئاراستێ رستێ بۆ ناڤەندا ریزێ | |
| دهێتە بکارئینان بۆ گوهۆڕینا ئاراستێ رستێ بۆ لایێ راستێ یێ بەرپەڕی | |
| دهێتە بکارئینان بۆ رێکوپێککرنا نڤیسینا برگا ژ هەردوو لایانڤە(راست وچەپ) ئەگەر دوگما(Enter)نەهاتبیتە بکارئینان | |

| | |
|---|---|
| دهێته بکارئینان بۆ دوورکرنا پیتێن نڤیسینێ ژ ئێك و دوو | |
| دهێته بکارئینان بۆ فرەهکرن وتەنگکرنێ دناڤبەرا برگاندا. | |
| دهێته بکارئینان بۆ گوهۆڕینا دەستپێکا ئاراستەی نڤیسینێ بۆ لایێ چەپێ یێ بەرپەڕی . | |
| دهێته بکارئینان بۆ گوهۆڕینا دەستپێکا ئاراستەی نڤیسینێ بۆ لایێ راستێ یێ بەرپەڕی . | |
| دهێته بکارئینان بۆ دانانا زنجیرا ژماران بۆ برگێن نڤیسینێ | |
| دهێته بکارئینان بۆ دانانا هێما بۆ برگێن نڤیسینێ | |
| دهێته بکارئینان بۆ کێمکرنا ڤالاهیا دەستپێکرنا ریزێ | |
| دهێته بکارئینان بۆ زێدەکرنا ڤالاهیا دەستپێکرنا ریزێ | |
| دهێته بکارئینان بۆ دانانا چوار چوڤێن نڤیسینێ | |
| دهێته بکارئینان بۆ دانانا رەنگەکی لدەوروبەرێن نڤیسینا دەستنیشانکری | |
| دهێته بکارئینان بۆ گوهۆڕینا رەنگێ نڤیسینێ | |

# شەریتا کەرەستێن ستاندەرد Standard Toolbar



| | |
|---|---|
| بۆ ڤەکرنا فایلەکێ (دوکیۆمێنتەکێ) تازە (نوو) | |
| بۆ ڤەکرنا فایلەکێ (دوکیۆمێنتەکێ) ڤەگرتی (هەلگرتی) | |
| بۆ ڤەگرتنا (هەلگرتنا) فایلان (دوکیۆمێنتان) | |
| بۆ پوستێن ئەلیکترۆنی (ئیمێل) | |
| بۆ لێگەریانێ لسەر نڤیسینەکێ | |
| بۆ چاپکرنێ | |
| بۆ بەرچاڤکرنا بەرپەڕی یان بەرپەڕان پێش چاپکرنێ | |
| بۆ راستڤەکرنا شاشیێن زمانی ورێنڤیسی | |
| بۆ برینا بەشەکێ دیار کری (دەستنیشانکری) | |
| بۆ کۆپیکرنا بەشەکێ دیار کری (دەستنیشانکری) | |
| نیساندنا بەشێ هاتیە برین یان کۆپیکرن | |
| کۆپیکرنا خەسلەتێن (تایبەتمەندیێن) بەشێ دەستنیشانکری | |
| لێزڤرین ژ پێنگاڤا دوماهیێ | |
| ڤەگەریان بۆ پێنگاڤا ئەم لێزڤرین | |

| | |
|---|---|
| ئینانه خوارا گرێدانه‌کا به‌ربه‌لاڤ | |
| بۆ به‌رچاڤکرن وڤه‌شارتنا شه‌ریتا که‌ره‌ستێن خشته‌ی (Tables and Boarders) | |
| بۆ دروستکرنا خشته‌یه‌کی | |
| بۆ چوونه دناڤ پرۆگرامێ ئێکسلدا (Excel) | |
| دابه‌شکرنا نڤیسینا ده‌ستنیشانکری دناڤ به‌رپه‌رێن فایلیدا بۆ چه‌ند ستوونان | |
| بۆ به‌رچاڤکرن وڤه‌شارتنا شه‌ریتا که‌ره‌ستێن وێنه‌کێشانێ (Drawing Toolbar) | |
| بۆ به‌رچاڤکرن وڤه‌شارتنا نه‌خشێ دوکیۆمێنتی کۆ ل لایه‌کێ په‌نجه‌را پرۆگرامێ ووردی دیار دبیت. | |
| بۆ به‌رچاڤکرن وڤه‌شارتنا خالێن برگان Paragraph Marks | ¶ |
| به‌رچاڤکرنا نڤیسینێ ب شێوێ دوور یان نێزیك | 100% |
| هاریکاری | |

# شەریتا لیستان Menu Bar

## لیستا File

### دروستكرنا فایلەكێ (دوكیۆمێنتەكێ) نوو (New)




لدەمێ پرۆگرامێ مایكرۆسۆفت وورد دهێتە ڤەكرن ئێكسەر فایلەكێ (دوكیۆمێنتەكێ) نوو بەرچاڤدبیت ودشیاندایە دناڤدا كارێ خۆ یێ مەبەست پێ ئەنجامبدەین ، یان لدەمەكێ ئەم كارێ لسەر فایلەكی ئەنجامبدەین و دحەزامەدابیت فایلەكێ دی یێ نوو ڤەكەین دێ ئێك ژڤان رێكێن خوارێ ئەنجامدەین.

١-ڤەكرنا لیستا (File) وكلیككرن لسەر فەرمانێ (New).

٢-لسەر شەریتا كەرەستێن ستاندەرد Standard Toolbar كلیككرن لسەر ئایكۆنێ (  ).

٣-ب رێكا كیبۆردێ هەردوو دوگمێن (Ctrl + N) پێگڤە بكاربینە.

# ڤەگرتنا فایلی Save

فایلەکێ نوو هاتە ئامادەکرن و بۆ پاراستنا ڤی فایلی ومانەڤەیا زانیاریێن وێ پێدڤیە بهێتە ڤەگرتن (Save کرن) دکۆمپیۆتەرێ مەدا وبڤی شێوەی:-

ل دەسپێکێ دفایلێ نوودا وپشتی تێئێخستنا چەند زانیاریان دێ ئێك ژڤان رێکێن خوارێ ئەنجامدەین.

**١-ڤەکرنا لیستا (File) وکلیککرن لسەر فەرمانێ (Save).**

**٢-لسەر شەریتا کەرەستێن ستاندەرد Standard Toolbar کلیککرن لسەر ئایکۆنێ ( ).**

**٣-ب رێکا کیبۆردی هەردوو دوگمێن (Ctrl + S) پێکڤە بکاربینە.**

پشتی ئەنجامدانا ئێك ژڤان رێکان ئێکسەر بۆکسا ڤەگرتنێ ( Save As) دێ هێتە ڤەکرن وژڤێ بۆکسێ دناڤ خانا(Save in) دا دێ درایڤێ مەبەست بۆ ڤەگرتنا فایلێ مە دیارکەین (بنێرە وێنێ بۆکسێ)، دناڤدا دیار دبیت کۆ درایڤێ (D) هاتیە دەستنیشانکرن بۆ فایلێ مە ودهەمان دەمدا ولدووڤ حەز و پێدڤیا مە دشیاندایە دناڤ هەر درایڤەکێ دیدا فایلێ خۆ ڤەگرین ، هەروەسا دشیاندایە بهێتە ڤەگرتن دناڤ ئامیرێن ڤەگرتنێ یێن یەدەك وەك ( Flopy Disk، Flash Disk ،...هتد).

وبۆ ڤەگرتنا فایلێ خۆ بۆ جارا ئێکێ پێدڤییە بهێتە ناڤکرن ب ناڤەکێ نوو ونابیت ل هەمان درایڤێ دەستنیشانکری ئەو ناڤە هەبیت وبۆ ڤێ چەندێ د لاکێشا (File Name)دا دێ ناڤی نڤیسین وکلیکێ لسەر دوگما (Save) دکەین ، ئەڤجا فایلێ مە دێ هێتە ڤەگرتن دناڤ درایڤێ هاتیە دەستنیشانکرندا.

هەر فایلەکێ هاتبیتە ڤەگرتن دشیاندایە ب بەردەوامیا رۆژانە بهێتە ڤەکرن وکار لسەر بهێتە ئەنجامدان وبۆ ڤەگرتنا هەر گوهۆڕانکاریەکا دکەڤیتە دناڤ فایلیدا پێدڤییە ئێك ژوان رێکێن ڤەگرتنا فایلی بکاربینین.

## ڤەکرنا فایلێ ڤەگرتی (تێئێخستی) Open

پشتی ڤەگرتنا فایلی و ل هەر رۆژەکا ئەم پێدڤی زێدەکرنا زانیاریێن وێ بووین یان بۆ خواندنا ناڤەرۆکا وێ وگوهۆڕینا چەند زانیاریان یان بۆ هەر کارەك ومەبەستەکا دی ، ئەم پێدڤی ڤەکرنا فایلی نە وبۆ ئەنجامدانا ڤی کاری ئێك ژڤان رێکێن خوارێ ئەنجامددەین.

١-ڤەكرنا ليستا (**File**) وكليككرن لسەر فەرمانێ (**Open**).

٢-لسەر شەريتا كەرەستێن ستاندەرد **Standard Toolbar** كليككرن لسەر ئايكۆنێ ( ).

٣-ب رێكا كيبۆردى هەردوو دوگمێن (**Ctrl + O**)پێگڤە بكاربينە



پشتى ئەنجامدانا ئێك ژڤان رێكان بۆكسا ڤەكرنا فايلان (Open) دهێتە ڤەكرن ، دناڤ خانا (Lock In)دائەو درايڤێ فايل دناڤدا هاتيە ڤەگرتن دەستنيشاندكەين وبڤێ چەندێ ناڤێ فايلێ مەبەست بۆ ڤەكرنێ دێ دەستنيشانكەين وكليكێ لسەر دوگما (Open) دكەين.

**تێبينى:-**

١- لدەمێ فايلەكێ نوو ڤەدكەين ونڤيسينا مەبەست پێ هاتيتە ئەنجامدان وفايل



نەهاتبیتە ڤەگرتن وهەوڵبدەین فایلێ خۆ بگرین ئێکسەر کۆمپیۆتەر ب رێکا بۆکسەکا تایبەت ئاگەهداریا مە دکەت (**ئایا فایل بهێتە ڤەگرتن یان نە؟**) لڤێرێ ئەگەر کلیکێ لسەر (Yes) بدەین ئێکسەر بۆکسا ڤەگرتنێ (Save As)دێ هێتە ڤەکرن ناڤەکی دێ دەینە فایلی وکلیکێ لسەر (Save) دکەین ئەڤجا فایل دێ هێتە ڤەگرتن وگرتن.

٢-ئەگەر مە بڤێت فایلەکی دوو جارا ڤەگرین هەر ئێك ب ناڤەکی یان ل درایڤەکێ دیدا دووبارەبیت ، یان ئەگەر مە بڤێت فایلێ ڤەگرتی پشتی ئەنجامدانا گۆهۆڕانکاریا دناڤدا ب ناڤەکێ دی ڤەگرین بۆ وێ چەندێ فایلێ کەڤن بمینیت ، بۆ ئەنجامدانا ڤان کاران دلیستا (File)دا کلیکێ لسەر فەرمانێ (Save As) دکەین ئێکسەر بۆکسا ڤەگرتنا فایلا دهێتە ڤەکرن وب هەمان شێوێ بەری نۆکە هاتیە شلوڤەکرن کاردکەین.

٣-بۆ ڤەگرتنا گوهوڕانکاریا دناڤ فایلێ ڤەگرتیدا پێدڤییە ئێك ژ رێکێن ڤەگرتنا فایلی دماوێ (٥-١٠) دەقیقان بکاربینین.

# ئامادەکرنا بەرپەڕی Page Setup

بۆ هەر نڤیسینەکێ پێدڤییە بەرپەڕێ خۆ ئامادەبکەین ژلایێ قەبارەی وپەراوێزێن وی ڤە ، بۆ ڤێ مەبەستێ دێ لیستا (File) ڤەکەین و فەرمانێ (Page Setup) کلیکدکەین بۆکسەك دێ هێتە بەرچاڤکرن ، ئەڤ بۆکسە ژ چەند بەرپەڕێن سەرەکی پێکهاتیە وەك:-




١- **Marigns** :- ئەڤ بەرپەڕە تەرخانکریە بۆ ئەنجامدانا ڤان کاران:-

أ. دیار کرنا پەراوێزێن هەر چوار لایێن بەرپەڕی ( سەری Top، خوارێ Buttom ، راستێ Right ، چەپێ Left). ب زێدەکرنا ژمارا هەرئێك ژڤان لایان دێ ڤالاهی زێدەبیت ب کێمکرنا وێ دێ ڤالاهی کێمبیت. ئەگەر بەرپەڕ بهێنە دەرزیگدان(دوگمەکرن) یان بکەڤنە دناڤ پەرتووکێدا یان نامیلکێدا بۆ ڤێ چەندێ کۆ نڤیسینا مە دوی لایدا نەکەڤیتە ژێر دەرزیگدانێ پێدڤییە هەردوو خانێن (پەراوێزێ دەرزیگدانێ Gutter )و (لایێ دەرزیگدانێ Gutter Position ) بهێنە دیارکرن.

ب. دیار کرنا شێوێ بەرپەڕێ نڤیسینێ (ستوونی یان پانی) بۆ ڤێ چەندێ دوو وێنێن بەرپەڕان د پشکا (Orientation) دا هاتینە بەرچاڤکرن ئەوژی (Portrait بۆ شێوێ ستوونی ) و (Landscape بۆ شێوێ پانی)




٢- **Paper** :- ئەڤ بەرپەرە تەرخانکریە بۆ دیارکرنا قەبارە وجۆرێ بەرپەڕێ نڤیسینێ دخانا (Paper Size)دا چەند جۆرەکێن ستاندەرد یێن بەرپەڕان هەنە ولدووڤ ئامیرێ چاپکرنێ یێ لبەردەست دشیاندایە ئێك ژڤان جۆران هەلبژێرین وەك (A٤ , A٣ , A٥ , Letter،....هتد). لێ ئەگەر مەبڤێت بەرپەرەکێ تایبەت دەستنیشان بکەین دێ ب رێکا راستەی پانیاتی ودرێژاتیا وێ پیڤین و دهەردوو خانێن (Width و Height) دا نڤیسین.

پشتی پەراوێز وقەبارێ بەرپەڕی دهێنە دەستنیشانکرن کلیکێ لسەر دوگما (Ok) دکەین بەرپەڕ ب وی شێوەی دهێتە بەرچاڤکرن.

## بەرچاڤكرن بەری چاپكرنێ Print Preview

بەری چاپكرنا هەر نڤیسینەكێ باشترە بزانین شێوێ چاپكرنا نڤیسینێ دێ چاوابیت وبۆ ڤێ چەندێ دێ ئێك ژڤان رێكان ئەنجامدەین:-

١-ڤەكرنا لیستا (File) وكلیككرن لسەر فەرمانێ (Print Preview).

٢-لسەر شەریتا كەرەستێن ستاندەرد Standard Toolbar كلیككرن لسەر ئایكۆنێ ( ).

## چاپكرن Print

فەرمانەكێ لیستا (File)ە ، دهێتە بكارئینان بۆ چاپكرنا نڤیسینێن مە . بۆ بكارئینانا ڤێ فەرمانێ ئێك ژڤان رێكان بكاربینە:-

١-ڤەكرنا لیستا (File) وكلیككرن لسەر فەرمانێ (Print).

٢-لسەر شەریتا كەرەستێن ستاندەرد Standard Toolbar كلیككرن لسەر ئایكۆنێ ( ).

٣-ب رێكا كیبۆردێ هەردوو دوگمێن (Ctrl + P) پێكڤە بكاربینە.

پشتی بکارئینانا ئێك ژڤان ریێکێن لسەری دیارکری بۆکسا چاپکرنێ دێ بڤی شێوەی هێتە بەرچاڤکرن:-




## ئەڤ بۆکسە پێکهاتیە ژڤان پشکێن سەرەکی

أ- **Printer** :- دڤێ پشکێدا و دناڤ لاکێشا (Name)دا دێ ناڤێ ئامیرێ چاپکرنێ هێتە دیار کرن کۆ ل پێش دەم بۆ کۆمپیۆتەری هاتیە نیاسکرن.

ب- **Page range** :- بۆ دیارکرنا ئەو بەرپەرێن دهێنە چاپکرن وژمارا دانەیێن هەر بەرپەرەکی وئەڤ پشکە هاتیە دابەشکرن بۆ ڤان خالان:-

١- **All** :- بۆ چاپکرنا هەمی بەرپەرێن فایلی.

٢- **Current Page** :- بۆ چاپکرنا ئەو بەرپەرێ نۆکە کار لسەر دهێتە کرن ئانکو (نۆکە کارسەرێ نڤیسینێ دناڤدا).

٣- **Pages** :- بۆ چاپکرنا ئەو بەرپەرێن ژمارێن وان دهێنە دەستنیشانکرن وەك:-

| | |
|---|---|
| ٤ | چاپكرنا بەرپەرێ ژمارە (٤) |
| ٦-٣ | چاپكرنا بەرپەرێ ژمارە (٣) تا بەرپەرێ ژمارە(٦) |
| ٧, ٢ | چاپكرنا بەرپەرێ ژمارە (٢) وبەرپەرێ ژمارە (٧) |

بۆ دياركرنا ژمارا دانەيێت چاپكرنێ دلاكێشا( **Number of Copies**) دا دهێتە ديار كرن.

## گرتنا پرۆگرامی Exit

دناڤ ليستا (File) دا دوو فەرمانێن گرتنێ هەنە. فەرمانێ (Close) دهێتە بكارئينان بۆ گرتنا فايلێ(دوكيۆمێنتێ) ڤەكری ئەڤجا بتنێ فايل دهێتە گرتن و پەنجەرا پرۆگرامی دمينتە ڤەكری، لێ بۆ گرتنا پەنجەرا پرۆگرامی فەرمانێ (Exit) دهێتە بكارئينان.

# ليستا Edit

ئەڤ ليستە پێكهاتيە ژڤان فەرمانێن خوارێ




١-Undo :- لێزڤرين ژ پێنگاڤا دوماهيێ.

٢-Redo :- ڤەگەريان بۆ پێنگاڤا ئەم لێزڤرين.

٣-Cut :- برينا بەشەكێ دياركرى.

٤-Copy:- كۆپيكرنا بەشەكێ دياركرى.

٥-Paste :- نيساندنا ئەو بەشێ هاتيە برين يان كۆپيكرن.

٦- Clear :- بۆ ژێبرنا بەشەكێ ديار كرى.

٧-Select All :- بۆ دەستنيشانكرنا هەمى ناڤەرۆكا فايلى.

٨- Find:- بۆ ديتنا (لێگەريانا) نڤيسينەكێ د دەمەكيدا نڤيسينا مە يا زۆربيت ومە بڤێت ب زووترين دەم بگەهينە نڤيسينەكا مەبەست دێ فەرمانێ Findبكارئينين ئێكسەر بۆكسەك بەرچاڤ دبيت وئەڤ بۆكسە ژ ڤان پشكان پێكدهێت:-



ب. **Find** :– دڤیٚ پشکیٚدا ئەو نڤیسینا مە بڤێت لێگەڕیانیٚ لسەر بکەین دیٚ هێتە نڤیسین دناڤ لاکێشا (Find what) دا ولدووڤدا کلیکیٚ لسەر (Find Next) دکەین.

ج. **Replace**:–بۆ گوهۆڕینا نڤیسینا لسەر لێگەریاین بۆ شێوەیەکیٚ دی، پشتی کلیکیٚ لسەر (Replace) دکەین دوو لاکێش دناڤ بۆکسیٚدا دیار دبن ، لاکێشا ئێکیٚ ئەو پەیڤا ئەم لێگەڕیانیٚ لسەر دکەین و لاکێشا دوویٚ تەرخانکریە بۆ نڤیسینا پەیڤا گوهۆڕ .




بۆ نموونە ئەگەر مەبڤێت هەمی پەیڤێن (بەرنامە) دناڤ نڤیسینا مەدا بهێنە گوهارتن بۆ پەیڤا (پرۆگرام) دیٚ ڤان کاران ئەنجامدەین.

١–دناڤ لاکێشا (Find what) دا دیٚ نڤیسین (بەرنامە).

٢–دناڤ لاکێشا (Replace with)دا دیٚ نڤیسین (پرۆگرام).

٣–کلیککرن لسەر دوگما (Replace All).

د. **Go To**:- ئەڤ فەرمانە دهێتە بکارئینان بۆ چوونا دناڤ بەریپەرێ پێش یان پاش وهەرووەسا بۆ چوونا دناڤ بەریپەرەکیدا ب رێکا نڤیسینا ژمارا بەریپەری. بۆ نموونە ئەگەر فایلێ مە ژ(٨٤) بەریپەران پێکهاتبیت ودحەزامەدابیت ئێکسەر بچینە دناڤ بەریپەرێ ژمارە (٢٣) دا دێ ڤان کاران ئەنجامدەین.




١- دناڤ خانا (Go To what)دا دێ (Page) هەلبژێرین

٢- دلاکێشا ( Enter Page Number) دا دێ ژمارە (٢٣) نڤیسین.

٣- کلیکێ لسەر دوگما (Go To) دکەین.

# لیستا View

لدەمێ كلیكێ لسەر لیستا View دكەین كۆمەڵەكا فەرمانان دەردكەڤیت وبقی شێوێ خوارێ:-

١- Normal:- بۆ بەرچاڤكرنا بەرپەڕی ب شێوەیەكێ ئاسایی.




٢-Web Layout:- بۆ بەرچاڤكرنا بەرپەڕی ب شێوێ بەرپەڕەكێ ئینتەرنێتێ.

٣-Print Layout:- بۆ بەرچاڤكرنا بەرپەڕی ب شێوێ چاپكرنێ ودیار كرنا چوار چوڤێن نڤیسینێ.

٤- Outline:- بۆ بەرچاڤكرنا بەرپەڕی ب شێوەیەكێ بەرفرەه.

٥-Task Pane:- بۆ بەرچاڤكرن وڤەشارتنا بەشێ تاسك پەین (بەشێ ئەركان).

٦-Toolbars:- بۆ بەرچاڤكرن وڤەشارتنا هەر شەریتەكا كەرەستان لدووڤ حەزا مە.

٧-Ruler:- بۆ بەرچاڤكرن وڤەشارتنا راستەییێ (راستەیا لایێ چەپێ یان راستێ وهەروەسا راستەیا لایێ سەری).

٨-Document Map:- بۆ بەرچاڤكرن وڤەشارتنا نەخشێ دوكیۆمێنتی كۆ ل لایەكێ بەرپەڕی دەردكەڤیت.

٩- **Header and Footer** :- ئەڤ فەرمانە دهێتە بكارئينان بۆ دياركرنا نڤيسينەكێ يان وێنەيەكی ل لايێ سەری يان خوارێ يێن هەمی بەرپەڕێن فايلی. پشتی ئەڤ فەرمانە دهێتە كليككرن ئێكسەر لاكێشەك ب ناڤێ (Header) بەرچاڤدبيت دناڤ ڤێ لاكێشێدا نڤيسين و وێنێن سەرێ بەرپەڕان دهێنە ئامادەكرن .

Header

**پولا هەشتێ بنەرەتی**

---

وبۆ دياركرنا نڤيسين و وێنێن لايێ خوارێ يێ بەرپەڕان ، پێدڤيیە جارا ئێكێ ئەم لاكێشا (Footer) ديار بكەين ئەوژی ب رێكا كليككرن لسەر لايێ خوارێ يێ بەرپەڕی.

Footer

---

(1)

د دووڤدا وبۆ زڤرينێ دناڤ نڤيسينا ئاساييدا دوو جارا كليكێ لسەر بەرپەڕێ نڤيسينێدا بكە يان لسەر شەريتا كەرەستێن (Header and Footer)[1] دوگما (Close) كليكبكە.

---

[1] ئەڤ شەريتە ئێكسەر پشتی كليككرنا فەرمانێ (Header and Footer) دهێتە بەرچاڤكرن.

١٠- **Full Screen** :- دهێته بكارئینان بۆ دیار كرنا بەرپەرێن نڤیسینێ لسەر هەمی قەبارێ شاشێ وبڤێ چەندێ پەنجەرا پرۆگرامی و هەمی شەریتێن وێ دهێنە ڤەشارتن وبتنێ بەرپەرێ نڤیسینێ دیار دبیت.

١١- **Zoom**:- بۆ دووركرن ونێزیككرنا بەرپەرێ لسەر شاشێ.

# لیستا Insert

## دانانا ژمارا بەرپەری Page Numbers




لەدەمێ ئەم پەرتووکەکێ یان راپۆرتەکێ یان هەر بابەتەکێ دی بنڤیسین ئەم پێدڤی ب نڤیسینا ژمارێن بەرپەراینە ، بۆ ڤێ چەندێ دێ ڤان کارێن خوارێ ئەنجامدەین.

١-ڤەکرنا لیستا Insert.

٢-کلیککرن لسەر فەرمانێ Page Numbers

٣-بۆکسەك بەرچاڤ دبیت ب ناڤێ( Page Numbers)، ئەڤ بۆکسە ژ ڤان پشکێن خوارێ پێکهاتیە:-

أ. **Position**:- بۆ دیار کرنا ئەو لایێ ژمارا بەرپەری دناڤدا دهێتە نڤیسین. دناڤ ڤێ پشکێدا دوو هەلبژارتن هەنە :-

- Top of Page سەرێ بەرپەری.
- Buttom of Page لایێ خوارێ یێ بەرپەری.

ب. **Alignment** :- بۆ دیارکرنا ئاراستێ ریزێ یێ نڤیسینا ژمارا بەرپەری ، وبڤی شێوەی هاتینە دیار کرن.

- Right لایێ راستێ یێ ریزێ
- Center ناڤەندا ریزێ
- Left لایێ چەپێ یێ ریزێ

- Inside و Outside بۆ دیارکرنا بەرپەرێن ژمارێن کت وجووت (دناڤ یان ژدەرڤە)ی بەرپەری




**تێبینی:-** پشکا ( Show number on first page) دهێتە بکارئینان بۆ دانان و ژێبرنا ژمارا بەرپەرێ ئێکێ.

**پشتی پرکرنا زانیارێن بۆکسا Page Number دهێتە دیارکرن کلیکێ لسەر دوگما (Ok) دکەین.**

## دانانا مێژوو و دەمژمێرێ Date and Time

مێژوو و دەمژمێر پێدڤییەکا بەردەوامە بهێنە دیار کرن لسەر نڤیسینێن کۆمپیۆتەریدا ، بۆ ڤێ چەندێ ئاسانکاریەکا باش هاتیە ئامادەکرن ئەوژی ب رێکا کلیککرنێ دناڤ لیستا (Insert) دا لسەر فەرمانێ (Date and Time) ئێکسەر بۆکسەك بەرچاڤدبیت ، دناڤ ڤێ بۆکسێدا ودخانا (Language ) دا ئەگەر ئەم (Arabic)



هەلبژێرین ئەڤ چەندە رادگەهینیت کۆ مێژوو و دەمژمێر دێ ب زمانێ عەرەبی هێنە دیار کرن ، وئەگەر مەبڤێت ب زمانێ ئینگلیزی دیار بن دێ (English) هەلبژێرین. هەرووەسا دخانا (Calendar Type)دا ئەگەر (Western) هەلبژێرین دێ مێژوو ب سالێن زایینی دیاربیت وبۆ دیار کرنا مێژوویێ ب سالێن مشەختی دێ (Arabic Hijri) هەلبژێرین .

چەند جۆرەك ژ شێوێن دیار کرنا مێژوو و دەمژمێران هاتینە ئامادەکرن دناڤ خانا (Available Format)دا بۆ هەلبژارتنا هەر ئێکێ دەستنیشان دکەین وکلیکێ لسەر (Ok) دکەین.

## نڤیسینا ئامادەکری Auto Text

ب بەردەوامیا رۆژانە کار لسەر کۆمپیۆتەری دهێتە کرن و گەلەك جاران چەند پەیڤەك یان رستەیەك دناڤ نڤیسیناندا دووبارەدبیت ، ئەڤجا بۆ ڤێ چەندێ ل(Auto Text)دا چەند نڤیسینێن ئامادەکری هاتینە دانان ، بۆ ئینانا هەر نڤیسینەکا ئامادەکری دناڤ نڤیسینا مەدا دێ لیستا (Insert) ڤەکەین و کلیکێ لسەر فەرمانێ (Auto Text) دکەین چەند نڤیسینێن ئامادەکری بەرچاڤدبن وبکلیککرنا هەر نڤیسینەکێ ئێکسەر دێ هێتە



دناڤ نڤیسینا مەدا. لێ ئەگەر مەبەستا مە ئەو بیت ئەم نڤیسینەکا تایبەت ئامادەبکەین کۆ دپاشەرووژێدا ئیکسەر ب رێکا فەرمانێ (Auto Text) بینینە دناڤ نڤیسینێن خۆدا دێ ڤان کارێن خوارێ ئەنجامدەین:-

١-ڤەکرنا لیستا (Insert) وکلیککرن لسەر (Auto Text)

٢-بۆکسەك بەرچاڤدبیت نڤیسینا مەبەست پێ دناڤ پشکا (Enter Auto Text Entiers Here)دا دهێتە نڤیسین بۆ نموونە(وەزارەتا پەروەردێ).

٣-کلیککرن لسەر دوگما (Add) و دووڤدا (Ok).

ئەڤ نڤیسینا هاتیە زێدەکرن دیاردبیت دناڤ پشکا (Normal) دا کۆ پشکەکا (Auto Text)ە . بڤێ چەندێ هەردەمەکێ ئەم پێدڤی بووین بنڤیسین (وەزارەتا پەروەردێ) دێ بڤی شێوێ خوارێ ئەنجامدەین:-

**Insert→Auto Text→Normal→وەزارەتا پەروەردێ**

هەروەسا دشیاندایە نڤیسینەکێ ژناڤ بۆکسا Auto Text دا لادەین ئەوژی ب رێکا دەستنیشانکرنا نڤیسینێ وکلیککرن لسەر دوگما Delete.

## هێما Symbol



ئینانا هێمایەکێ بۆ ناڤ بەرپەرێ مەبەست ژ لیستا (Insert) کلیکێ لسەر فەرمانێ (Symbol) دکەین بۆکسەك دهێتە بەرچاڤکرن

هەر هێمایەکێ مەبەست پێ دەستنیشان دکەین وکلیکێ لسەر دوگما (Insert) دکەین.

## ئینانا وێنەیەکی Picture

پرۆگرامێ مایکرۆسۆفت وورد پرۆگرامەکێ تایبەتە ب نڤیسینێڤە ونەخشێن وێ و دهەمان دەمدا دشیاندایە وێنا دانینە دناڤ بەرپەرێن مەبەست پێ ، بۆ ئەنجامدانا ڤێ کاری دناڤ لیستا (Insert) دا دێ (Picture) هەلبژێرین ئێکسەر چەند شێوێن وێنا بەرچاڤ دبن وەك:-

١- **Clip Art** :- دەمێ دهێتە کلیککرن ل لایێ راستێ یێ بەرپەری پەنجەرەك بەرچاڤدبیت ودناڤ ڤێ پەنجەری لدەمێ کلیکێ لسەر ( Search) دکەین وێنە دهێنە بەرچاڤکرن وبکلیککرنا هەر وێنەیەکی ئێکسەر دهێتە ئینان بۆ ناڤ بەرپەری، وەك نموونە ئەڤ وێنێ کۆمپیوتەری بڤێ رێکێ هاتیە ئینان.






٢- **From File**:-ئینانا وێنەیەکێ ڤەگرتی دناڤ درایڤەکێ کۆمپیوتەریدا یان دناڤ هەر پارچەکا یەدەك یا ڤەگرتنێدا ، لدەمێ

ئەڤ فەرمانە دهێتە کلیککرن بۆکسەکا ب هەمان شێوێ بۆکسا



ڤەکرنا فایلێن ڤەگرتی ڤەدبیت هەروەسا لڤێرێ دناڤ (Lock in)دا جهێ وێنەی (درایڤ + فولدەر) دهێتە دیارکرن و وێنێ مەبەست دهێتە دەستنیشانکرن و کلیکێ لسەر دوگما (Insert) دکەین.



٣-**From Scanner or Camera**:- ئینانا وێنەی ژ ئامیرێ سکەنەری یان کامیرێ ب مەرجەکی دوی دەمیدا ئەڤ ئامیرە گرێداییت دگەل کۆمپیۆتەریدا.

٤-**Organization Chart**:- ئەڤ فەرمانە دهێتە بکارئینان بۆ دروستکرنا نەخشەیەکێ رێکخستی.

٥- **Auto Shapes**:- دڤێ پشکێدا کۆمەلەکا شێوێن هەمەجۆر هەنە ودشیاندایە هەر ئێك ژوان بکاربینین ولدووڤ پێدڤیا مە.



پشتی هەلبژارتنا هەر شێوەیەکێ مەبەست دێ ب رێکا راکێشان و بەردانا ماوسێ چەپێ وێنەکەین ، بۆ زێدەکرنا نڤیسینەکێ دناڤ وێنەیدا کلیکا راستێ یا ماوسی لسەر وێنەی بکاربینە و دناڤ لیستا کورتدا کلیکێ لسەر (Add Text) بکە.

٦-**Word Art**:- ب رێکا ڤێ فەرمانێ دشیاندایە نڤیسینەکا هونەری بنڤیسین.



پشتی Word Art دهێتە کلیککرن بۆکسەکا نڤیسینێن هونەری دهێتە بەرچاڤکرن شێوێ هونەری یێ مەبەست پێ دێ دەستنیشان کەین وکلیکێ لسەر (Ok) دێ کەین ئێکسەر بۆکسا نڤیسینێ بەرچاڤدبیت نڤیسنا خۆ دێ نڤیسین وکلیکەکا دی لسەر دوگما (Ok) دکەین.

**تێبینی**:- بۆ دەستکاریکرنێ دشێوێ وێنەی یان نڤیسینەکا هونەریدا وەك (چەسپاندنا جهێ وان ، روونکرن وتاریکرنا رەنگان ،...هتد) شەریتا کەرەستا ب ناڤێ (Picture) دهێتە بکارئینان.




**Chart**:- ب رێکا ڤێ فەرمانێ دشیاندایە نەخشێن ئاماری دروستبکەین.

# شەریتا کەرەستێن وێنەکێشانێ Drawing Toolbar




١. **Draw**:- ئەڤ پشکە پێکهاتیە ژ کۆمەکا فەرمانان کۆ دشیاندایە ب رێکا وان نڤیسینێ ببەینە پشت وێنەی یان بەروڤاژی وێنە بچیتە پشت نڤیسینێ یان بۆ زڤراندنا وێنەی ونڤیسینێ . هەر دڤێ پشکێدا کۆمەکا شێوێن جۆرا وجۆر وفەرمان وهێلێن هەمەرەنك هەنە کۆ دشیاندایە بهێنە بکارئینان.

٢. **Select Object**:- بۆ دەستنیشانکرنا وێنەیەکی یان شێوەیەکی.

٣. **Auto Shapes**:- پێکدهێت ژ کۆمەکا شێوێن جۆرا وجۆر کۆ دشیاندایە بکاربینین لدووڤ حەزامە.

٤. **Line**:- بۆ دروستکرنا پارچە راستە هێلێ.

٥. **Arrow**:- بۆ دروستکرنا تیشکان.

٦. **Rectangle**:-بۆ دروستکرنا چوار گوشان و لاکێشان.

٧. **Oval**:- بۆ دروستکرنا وێنێن ب شێوێ هێلکان یان بازنان.

٨. **Text Box**:- بۆ دروستکرنا چوار گوشە ولاکێشێن نۆرمال بۆ نڤیسینێ دناڤدا ب شێوەیەکێ ئاسۆیی یان ستوونی وهەرووەسا دشیاندایە وێنەیەکی بکەینە دناڤدا.

٩. Word Art:- دهێته بكارئینان بۆ نڤیسینێن هونەری یێن هەمەجۆر.

١٠. Organization Chart:-بۆ دروستكرنا نەخشێن رێكخستی.

١١. Clip Art:- ئەڤ ئایكۆنە پێكدهێت ژ كۆمەكا وێنێن ئامادەكری یێن هەمەجۆر ودشیاندایە هەر وێنەیەكێ مەبەست پێ بینینە دناڤ بەرپەریدا.

١٢. Insert Picture:-دهێتە بكارئینان بۆ ئینانا وێنان ژ (فلوپی دێسك ، سی دی ، فلاش دێسك)ی یان ژ درایڤەكێ كۆمپیۆتەری بۆ ناڤ فایلێ كار تێدا دهێتە كرن.

١٣. Fill Color:- بۆ رەنگكرنا پشكەكا دەستنیشانكری یا گرتی.

١٤. Line Color:- بۆ رەنگكرنا چێوێن وێنەی وەك (چوار گوشە ، لاكێشە ، بازنە ،...هتد) .

١٥. Font Color:- بۆ رەنگكرنا پیتێن نڤیسینێ.

١٦. Line Style:- پێكدهێت ژ كۆمەكا هێلان كۆ دشیاندایە ب رێكا ڤی ئایكۆنی ژ ئالیێ پانیاتیا هێلاڤە شێوێ هێلێ بگوهۆرین.

١٧. **Dash Style**:- پێكدهێت ژ كۆمەكا هێلان كۆ دشیاندایە ب رێكا ڤی ئایكۆنی ژ ئالیێ جۆرێ هێلێ ڤە شێوێ هێلێ بگوهۆرین.

١٨. **Arrow Style**:- بۆ گوهۆرینا شێوێ تیشكی.




١٩. **Shadow Style**:- بۆ دروستكرنا سیبەرەكێ بۆ نڤیسینێ یان وێنەیەكی ب مەرجەكی نڤیسین ب شێوێ Wort Art هاتبیتە نڤیسین.

٢٠. **٣D Style**:- دهێتە بكارئینان بۆ دیاركرنا سێ دووریا نڤیسینا هونەری (Word Art)و وێنێن هاتینە وێنەكێشان ب رێكا شەریتا كەرەستێن وێنەكێشانێ.




ئەگەر مەبڤێت گوهۆرانكاریەكێ لسەر دووریەكێدا بكەین دێ (3D Setting) كلیكدكەین شەریتەك دهێتە بەرچاڤكرن دناڤدا چەند ئایكۆنەك هەنە دهێنە بكارئینان بۆ(زێدەكرن ، كێمكرن ، زڤراندن ، رەنگكرن ، ...هتد)ا سێ دووریا دەستنیشانكری.



# لیستا Format

## دانانا ژمارا و هێما Bullets and Numbering

گەلەك جاران دنڤیسینادا ئەم پێدڤی زنجیرەكا برگێن نڤیسینێنە




ب رێكا دانانا ژماران یان هێما بۆ دەستپێكا هەر برگەكێ ،ئەڤ چەندە ب رێكا پرۆگرامێ ووردی دهێتە ئەنجامدان بڤەكرنا لیستا (Format) وكلیككرن لسەر فەرمانێ( Bullest and Numbering) ئەڤجا بۆكسەك بەرچاڤدبیت ،بۆ دانانا هێما و ژماران ڤان رێكا بكاربینە

١- بۆ دانانا هێمایەكێ وەك دەسپێكا برگەی دناڤ ڤێ بۆكسێدا بەرپەرێ (Bulleted) كلیكبكە ، كۆمەكا هێمایان




بەرچاڤ دبن ، هەر هێمایەكا مەبەست هەلبژێرە وكلیكێ لسەر دوگما (Ok).



٢- بۆ دانانا ژمارەیەکێ وەك دەسپێکا برگەی دناڤ ڤێ بۆکسێدا بەرپەرێ (Numbered) کلیکبکە ، کۆمەکا جۆرێن زنجیرێن ژماران بەرچاڤ دبن هەر زنجیرەکا مەبەست هەلبژێرە وکلیکێ لسەر دوگما (Ok)بکە.

## دانانا چوار چوڤێ بەرپەڕی Borders and Shading

بۆ دانانا چوار چوڤەکێ بۆ بەرپەرێ نڤیسینێ ل دەسپێکێ لیستا (Format) کلیکبکە و د دووڤدا فەرمانێ ( Borders and Shading) هەلبژێرە ، بۆکسەك دهێتە بەرچاڤکرن بەرپەرێ (Page Border) کلیکبکە ودناڤ خانا ( Style)دا شێوازەکێ چوار چوڤەی هەلبژێرە ، هەر چوارچوڤەکێ دهێتە




هەلبژارتن دشیاندایە رەنگێ هێلان ب رێکا خانا (Color) و پانیاتیا هێلان ب رێکا خانا (Width ) بهێنە گوهۆرین. پشتی دەست نیشانکرن و ئەنجامدانا گوهۆرینا لسەر شێوازێ چوار چوڤەی دوگما (Ok) کلیکبکە.

## دابەشكرنا نڤیسینێ بۆ چەند ستوونان Columns

ب شێوەیەكێ نورمال نڤیسین دناڤ بەرپەریدا ل ستوونەكێ دهێتە




نڤیسین ، لێ چەند جاران ئەم پێدڤینە نڤیسینا خۆ دابەشبكەین بۆ دوو ستوونا یان زێدەتر وەكۆ نموونە (نڤیسینێن گوڤار و رۆژنامان) ، بۆ ڤێ چەندێ دپرۆگرامێ مایكرۆسۆفت وورد دا فەرمانێ (Columns) هاتیە ئامادەكرن وبۆ بكارئینانا ڤێ فەرمانێ ودابەشكرنا نڤیسینێ بۆ چەند ستوونان ل دەسپێكێ نڤیسینا مەبەست دەست نیشاندكەین وكلیكێ لسەر لیستا (Format) دكەین وفەرمانێ (Columns) كلیكدكەین بۆكسەك بەرچاڤدبیت ، كاركرن دناڤ ڤێ بۆكسێدا بڤی شێوێ خوارێیە.

١- دناڤ پشكا (Presets) ژمارا ستوونێن مەبەست دەستنیشاندكەین وەك (ستوونەك ، دوو ستوون ، سێ ستوون ، دوو ستوون لێ ستوونا لایێ چەپێ مەزنتر ، دوو ستوون لێ ستوونا لایێ راستێ مەزنتر).

٢- ئەگەر دحەزامەدا بیت نڤیسینا مە بهێتە دابەشكرن بۆ زێدەتر ژ (٣) ستوونان ل خانا (Number of Columns) ژمارا مەبەست دیار دكەین.

٣-پشكا ( Width and Spacing) دهێته بكارئینان بۆ دیاركرنا جیاوازیەكێ دناڤبەرا ستووناندا وەك(ڤالاهیی ، پانیاتیا ستوونا) .

٤-بۆ دابەشكرنا ستوونان ژلایێ راستێ بۆ چەپێ ئانكو (نڤیسینێن عەرەبی وكوردی) پێدڤیە خانا (Right to Left) دەست نیشانكری بیت.

٥-بۆ دانانا هێلەكێ دناڤبەرا ستوونان خانا Line btweenدەست نیشاندكەین.

هەر جۆرەكێ بهێتە دەست نیشانكرن وهەر گوهۆرینەكا ئەنجامددەین دناڤ بەشێ (Preview) دهێتە بەرچاڤكرن. لدوماهیێ بۆ ئەنجامدانا كاری پێدڤییە دوگما (Ok) بهێتە كلیككرن.

## گوهۆرینا شێوازێ پیتان Change Case

ئەڤ فەرمانە دهێتە بكارئینان بۆ ئەنجامدانا چەند گوهۆرینەكا لسەر شێوازێ نڤیسینا پیتێن ئینگلیزی دناڤ رستە وبرگاندا ودشیاندایە ئێكسەر لدووڤ پێدڤییا مە نڤیسینێ بگوهۆرین.




بۆ بكارئینانا ڤێ فەرمانێ نڤیسینا مەبەست دەستنیشان بكە و لیستا (Format)

کلیکبکه و فەرمانێ (Change Case) هەلبژێرە ، بۆکسەك بەرچاڤدبیت چەند فەرمانەك دناڤدانە ، بکارئینانا هەر فەرمانەکێ گۆهۆڕینا بەرامبەر نڤیسی ئەنجامددەت.

١-Sentence case :- بۆ گوهۆڕینا پیتا ئێکێ ژ رستێ بۆ شێوێ (Capital).

٢-Lowercase:- بۆ گوهۆڕینا هەمی نڤیسینا دەست نیشانکری بۆ شێوێ بچووك (Small).

٣-UPPERCASE:- بۆ گوهۆڕینا هەمی نڤیسینا دەست نیشانکری بۆ شێوێ مەزن (Capital)

٤-Title Case:- پیتا ئێکێ ژ هەر پەیڤەکێ ب شێوێ مەزن (Capital) بهێتە نڤیسین.

٥-tOGGLE cASE:- دهێتە بکارئینان بۆ بەروڤاژیکرنا پیتان ئانکو یا مەزن بکەتە بچووك ویا بچووك بکەتە مەزن.

# ليستا Tools

## رێنڤيس و رێزمان Spelling and Grammar

ئەڤ فەرمانە دهێتە بكارئینان بۆ راستڤەكرنا شاشیێن رێنڤیسی وریزمانی دناڤ نڤیسینێن زمانێ ئینگلیزیدا.




ئەگەر شاشیەكا رێنڤیسێ دناڤ پەیڤێدا هەبیت هێلەكا سۆر ل ژێردا دهێتە دانان ، و ئەگەر شاشیەكا رێزمانی دناڤ نڤیسینێدا هەبیت هێلەكا كەسك ل ژێردا دهێتە دانان ، بۆ زانین هەردوو هێلێن (سۆر و كەسك) لدەمێ چاپكرنێ لسەر بەرپەرێ ناهێنە دیار كرن.

بۆ راستڤەكرنا هەر شاشیەكا رێنڤیسی یان رێزمانی هەبیت ئێك ژڤان رێكان بكاربینە.

١- بكلیككرنا راستێ لسەر پەیڤا شاشی لیستەكا كورت بەرچاڤدبیت چەند پەیڤەك وەكو پێشنیار دناڤدانە پەیڤا راست هەلبژێرە (كلیكبكە).

٢- ڤەكرنا لیستا (Tools) وكلیككرن لسەر فەرمانێ (Spelling and Grammar) بۆكسەك بەرچاڤدبیت دناڤدا پەیڤا راست هەلبژێرە و دوگما Change كلیكبكە. هەرووسا ئەگەر مەبڤێت هەمی شاشیێن پەیڤەكێ ب ئێكجار راستڤەكەین پەیڤا راست بۆ هەلبژێرە و دوگما ( Change All) كلیكبكە.

# راستڤەكرنا ئێكسەر Auto Correct Options

ئەڤ فەرمانە دهێتە بكارئینان بۆ دانانا كورتە نڤیسینەكێ و راستڤكرنا وێ بۆ نڤیسینەكا درێژ ب شێوەیەكێ بلەز. مفا ژ ڤێ فەرمانێ دهێتە وەرگرتن لدەمێ ئەم زۆر پێدڤی نڤیسینەكێ دبین وبۆ وێ چەندێ كۆ ب شێوەیەكێ بلەز ئەم ڤێ نڤیسینێ بنڤیسین پەیڤەك دهێتە ئامادەكرن ب مەرجەكی ئەڤ پەیڤە ب كێماسی ژ (٢) پیتان پێكبهێت وئەڤێ پەیڤی چ رامان دناڤ زمانیدا نەبن و لدمێ ئەڤ پەیڤە دهێتە نڤیسین و دوگما راستەی (Spacebar) لسەر كیبۆردی بكاردئینین ئێكسەر ئەڤ پەیڤە دهێتە گوهۆرین بۆ وێ نڤیسینا مەبەست. بۆ ئامادەكرنا ڤان جۆرە پەیڤان وراستڤەكرنا ئێكسەر بۆ نڤیسینەكا دی ڤان پێنگاڤا بكاربینە.




١- ڤەكرنا لیستا (Tools) وفەرمانێ (Auto Correct) كلیكبكە.

٢- بۆكسەك بەرچاڤدبیت ، دیشكا (Auto Correct)دا و دناڤ لاكێشا (Replace) دا پەیڤا

کورت بنڤیسە بۆ نموونە ( هکع ، رپد ، رگسد ، ....هتد)
بەرامبەری پەیڤا کورت ودناڤ لاکێشا (with) دا نڤیسینا مەبەست بنڤیسە وەك:-

| | |
|---|---|
| هکع | هەرێما کوردستانا عیراقێ |
| رپد | رێڤەبەریا پەروەردا دهوکێ |
| رگسد | رێڤەبەریا گشتی یا ساخلەمیا دهوکێ |

پشتی پەیڤ ورستێن راستڤەکرنێ دهێنە ئامادەکرن دشیاندایە هەر دەمەکی بکاربینین. بۆ نموونە ئەگەر ئەم پێدڤیبووین بۆ نڤیسینا رستا (هەرێما کوردستانا عیراقێ) بتنێ دێ نڤیسین (هکع) ودوگما (Spacebar) کلیکدکەین.

هەروەسا دشیاندایە هەر پەیڤەك ورستەکا ئامادەکری لادەین ئەوژی دناڤ بۆکسێدا پەیڤێ دەستنیشان بکەین و کلیکێ لسەر دوگما (Delete)بکەین.

# لیستا Table

## دروستکرنا خشتەیەکی




بۆ دروستکرنا هەر خشتەیەکی ڤان پێنگاڤا بکاربینە:-

١-لیستا Table کلیکبکە

٢- دناڤ پشکا Insert دا Table کلیکبکە.

٣- بۆکسەك بەرچاڤدبیت دناڤ پشکا ژمارا (Number of Columns) دا ستوونێن خشتەی دیاربکە ودپشکا ژمارا (Number of Rows) دا ڕێزێن خشتەی دیار بکە. ودوگما (Ok) کلیکبکە.

ئێکسەر خشتەیەك لدووڤ ستوون وڕێزێن دیار کری بەرچاڤدبیت. دناڤ هەمان بۆکسێدا دوگمەك هەیە ب ناڤێ (Auto Format) بکلیککرنا ڤێ دوگمێ بۆکسەکا دی بەرچاڤدبیت چەند شێوێن ئامادەکری یێن خشتا لدووڤ دەستنیشانکرنا ژمارا ستوون و ڕێزێن هاتینە دیار کرن دشیاندایە شێوەیەکی



هەلبژێرین وکلیکێ لسەر دوگما (Apply) بکەین.

| | | | |
|---|---|---|---|
| | | | |
| | | | |
| | | | |

**تێبینی :-**

| | |
|---|---|
| Column | ستوون |
| Row | ڕێز |
| Cell | خانه |

# Tables and Borders شەریتا




١- بۆ دروستکرنا خشتەی ب رێکا پێنووسی.

٢- . بۆ ژێبرنا هێلان دناڤ بەرا خانێن خشتەیدا

٣- بۆ گوهۆڕینا جۆرێ هێلێ.

٤- بۆ گوهۆڕینا پانیاتیا هێلان.

٥- بۆ دیارکرنا رەنگێ هێلان

٦- بۆ گونجاندنا چێوە و هێلێن دناڤ خشتەیدا

٧- بۆ رەنگکرنا خانەیەکێ یان زێدەتر.

٨- دهێتە بکارئینان بۆ دروستکرنا خشتەیەکی وزێدەکرنا ستوونان ل لایێ راستێ یان چەپێ و زێدەکرنا ریزان ل لایێ سەری یان لایێ خوارێ یێ خشتەی و کۆمەڵەکا کارێن دی.

٩- بۆ تێکهەلکرنا دوو خانان یان زێدەتر.

١٠- بۆ دابەشکرنا خانەیەکێ یان زێدەتر بۆ چەند ستوون وریزان.

١١- بۆ رێکخستنا جهێ نڤیسینێ دناڤ خانەیدا.

١٢-بۆ رێکخستنا بلنداهیا ریزێن دەست نیشانکری.

١٣-بۆ رێکخستنا پانیاتیا ستوونێن دەست نیشانکری.

١٤-بۆ گوهۆرینا شێوێ خشتێ دەست نیشانکری بۆ شێوەیەکێ ئامادەکری دناڤ بۆکسا (Auto Format) دا.

١٥-بۆ گوهۆرینا ئاراستێ نڤیسینێ دناڤ خانەیدا ، سێ ئاراستە هەنە ئەوژی نڤیسینێن (نورمال ، بەرێ نڤیسینێ بۆ لایێ خوارێ ، بەرێ نڤیسینێ بۆ لایێ سەری) بۆ نموونە.





دهوك

١٦- دهێتە بکارئینان بۆ ریزکرنێ (ژمارە ژ بچووك بۆ مەزن) و ( پیتا دزمانێ کوردی وعەرەبیدا ژ (أ بۆ ی) و دزمانێ ئینگلیزیدا ژ ( A بۆ Z).

١٧- دهێتە بکارئینان بۆ ریزکرنێ (ژمارە ژ مەزن بۆ بچووك) و ( پیتا دزمانێ کوردی وعەرەبیدا ژ (ی بۆ أ) و دزمانێ ئینگلیزیدا ژ ( Z بۆ A).

١٨- دهێتە بکارئینان بۆ ئەنجامدانا کریارا (کۆمکرنا ژماران) دناڤ خشتەیدا.

# راهێنان

## لایێ تیوری

پ ١/ ئەڤێن خوارێ پێناسەبکە؟

**(Symbol , Replace , Open , Microsoft Word)**

پ ٢/ئەڤ بۆشاییێن خوارێ ب پەیڤەکا گونجای پڕبکە:-

١- دوگما Caps Lock دهێتە بکارئینان بۆ ________.

٢- بۆ نڤیسینا پیتا (ژ) دناڤ نڤیسینا کوردیدا پیتا ______ لسەر کیبۆردی دهێتە بکارئینان.

٣- فەرمانێ Save دهێتە بکارئینان بۆ ________.

پ٣/چاوانیا نڤیسینا (عەربی و کوردی) دناڤ پرۆگرامێ ووردیدا دیار بکە.

پ ٤/بۆشاتییێن خشتێ خوارێ پڕبکە:-

| فەرمان | ئایکۆن | بکارئینان | ب رێکا کیبۆردی |
|---|---|---|---|
| NEW | | | |
| | | | Ctrl+P |
| | | بۆ تۆخکرنا نڤیسینێ | |
| | | | |
| Paste | | | |

## لایێ پراكتیكی

بەرسڤا ڤان لـەڤێن خوارێ بدە:-

أ- فایلـەكی ئامادەبكە بەرپەڕێن وێ ب شێوێ ستوونی بن ، (١سم) بهێتە دانان بۆ پەراوێزێن هەر چوار لایێن بەرپەڕی ، دناڤ فایلیدا (ناڤێ خۆ یێ سیڤولی و ناڤێ قوتابخانا خۆ بنڤیسە)، فایلی ڤەگرە ب ناڤێ (كوردستان) دناڤ درایڤێ (D)دا.

ب-دناڤ فایلێ (كوردستان)دا ، لسەرێ هەمی بەرپەڕان بنڤیسە (هەرێما كوردستانا عیراقێ) و ل لایێ خوارێ یێ هەمی بەرپەڕان بنڤیسە (وەزارەتا پەروەردێ) وزنجیرا ژماران بۆ بەرپەڕان د ناڤەندا لبنێ بەرپەڕی دیار بكە.

ج-وێنەیەكی بینە دناڤ فایلێ (كوردستان)دا.

د-ئەڤ خشتێ ل خوارێ دیار كری ئامادەبكە ، د دووڤدا وانێن حەفتیێ دناڤدا بنڤیسە :-

| شەمبی | ئێك شەمبی | دوو شەمبی | سێ شەمبی | چوار شەمبی | پێنج شەمبی |
|---|---|---|---|---|---|
| | | | | | |
| | | | | | |
| | | | | | |
| | | | | | |
| | | | | | |
| | | | | | |

&&&&&&&&

# پشكا دووێ

## ئینتەرنێت Internet

### پێشگوتنەكا دیرۆكی یا ئینتەرنێتی

ئینتەرنێت زاراڤەكێ لێكدەرە ژ هەردوو پەیڤێن (ئینتەر) و (نێت) پێكهاتیە ، یا ئێكێ رامانا (جیهانی) ددەت ویا دووێ ب رامانا (تۆر) دهێت ، ئانكو (تۆرا جیهانی).

باشترین پێناسە بۆ ئینتەرنێتێ ئەوە كۆ تۆرەكا بەربەلاڤا كۆمپیۆتەرییە لسەرانسەری جیهانێ ، چەندین كۆمپیۆتەران د هەمی لایێن جیهانێدا پێكڤە گرێددەت وكارهێنەرێن وێ دشێن ل هەر كۆمپیۆتەرەكی ب ساناهی بگەهنە كۆمپیۆتەرێن دی وزانیاریان بڤەگۆهێزن.

دیرۆكا دروستبوونا ئینتەرنێتێ دزڤڕیت بۆ وان بزاڤێن هاتینە ئەنجامدان ژلایێ زانایێ ئەمریكی (پۆل باران) ل سالا (١٩٦٤ێ زایینی). لێ گەلەك ژێدەر دڕژدن كۆ دەسپێكا دروستبوونا ئینتەرنێتێ ڤەدگەڕێت بۆ سالا (١٩٦٩ێ) لدەمێ تۆرەكا مەزن هاتیە دروستكرن ژ لایێ (وەزارەتا بەرگریا ئەمریكا) وەك پرۆژەك بۆ ڤەگوهاستنا زانیاریان ب رێكا هێلا تەلەفونێ دناڤبەرا (وەزارەتا بەرگریا ئەمریكا و ناڤەندا ڤەكولینێن زانستی ل جیهانێ).

هەرووەسا دڤی باریدا ئێکەم ناڤەندا ڤەکۆلینێ ل باژێرێ لۆس ئەنجلوس ل زانکۆیا (کالیفۆرنیا) ب ناڤێ (Arpanet)هاتە دامەزراندن.

ل سالا(١٩٧٣)ێ پێشکەفتنەکا مەزن دبوارێ ئینتەرنێتێدا پەیدابوویە وبوویە ئەگەرەك بۆ ب ساناهیکرنا ڤەگوهاستنا زانیاریان دناڤبەرا پشکدارێن تۆرێدا.

پشتی پشکداریا (زانکۆیا لەندەن ل ئینگلتەرا و دەزگەهێ رادارا نەرویجی) دپرۆژێ وەزارەتا بەرگریا ئەمریکی وناڤەندا ڤەکولینێن زانستی ل جیهانێ پرۆژەیەکێ نوو ب ناڤێ ( پرۆژێ پێکڤەگرێدانا تۆران)هاتیە دروستکرن. ئەو تۆرا دناڤ ڤی پرۆژەیدا هاتیە بەردەست هاتە ناڤدارکرن ب ئینتەرنێت (Internet).

سیستەمێ پەیوەندیکرنێ دئینتەرنێتیدا ل سالا (١٩٨٦ێ) پێشکەفتنەکا بەرچاڤ بخۆڤە دیت لـدەمێ (دەزگەهێ نیشتیمانیا ئەمریکی بۆ زانستان)ل ویلایەتێن ئێکگرتیێن ئەمریکا چەند رێکێن نوو وبلەز ئینیاینە بەردەست بۆ ڤەگوهاستنا زانیاریان دناڤبەرا کۆمپیوتەرێن پشکدار د تۆرا ئینتەرنێتیدا. هەرووەسا ب دانانا پرۆتۆکۆلێن چاڤدێریا ڤەگوهاستنێ و پرۆتۆکۆلێن ئینتەرنێتێ ل سالا (١٩٩٠ێ) کو هاتیە نیاسین ب (**TCP/IP**) ئانکۆ

**(Transmission Control Protocol/Internet Protocol)**

هەژییە بێژین کو ل سالا (١٩٨٢ێ) ژمارا ئەو کەسێن پشکدار د تۆرا ئینتەرنێتێدا نەدگەهشتنە (١٠٠٠) کەسان ، لێ ل سالا (١٩٩٠ێ) بووینە (٧٠٠٠٠٠) حەفت سەد هزار کەس ل (٣٦) وەلاتێن جیهانێ ، لێ نهۆ مەلیۆنەها کەس لسەر روویێ ئەردی رۆژانە پشکداریێ دناڤ ڤێ تۆرێدا دکەن.

ژبەر بەربەلاڤبوونا بلەز یائینتەرنێتی پێدڤییە گرنگیدانەکا باش بۆ بهێتە کرن نەخاسمە ئەم وەکۆ مللەتێ کورد پێدڤییە گرنگیەکا باش بدەینە ڤێ تەکنلوژیایێ ژبۆ دیڤچوون و وەرگرتنا پێشکەفتنا جیهانێ دهەمی واراندا وئاڤاکرنا وەلاتێ خۆ لدووڤ ڤێ پێشکەفتنێ.

## مەبەستا بكارئينانا ئينتەرنێتێ

ل دەسپێكێ چێدبيت ئەڤ پرسيارە(ئايا بكارئينانا ئينتەرنێتێ دژيانا مەدا رۆژانە دێ ل كوويرێ بيت و چ مفا ژێ دهێتە وەرگرتن؟) دهزرا مە هەميياندا بيت. ئەم لڤێرێ دڤێت بەرسڤا ڤێ پرسيارێ بدەين ، بكارئينانا ئينتەرنێتێ دچەند خالاندا كورت بكەين ، د دووڤدا ئێك ب ئێك شلۆڤەبكەين.

١-تەماشەكرنا بەرپەرێن ئينتەرنێتێ ب رێكا (سايت)ا. كو خواندنا بابەتی وزانياريان ڤەدگريت.

٢-لێگەريان لسەر زانياريا.

٣-هنارتن و وەرگرتنا نامێن ئەليكترۆنی (پۆستا ئەليكترۆنی).

٤-گەنگەشەكرنا زێندی.

ئەڤە ژبلی چەندين مفايێن مەزنێن دی وەك (بازرگانيا ئەليكترۆنی و كرين وفرۆتن و چەند خزمەتێن دی).

دڤێ نڤيسينێدا دێ هەولدەين لسەر هەر ئێك ژ چوار خزمەتێن لسەری هاتينە ديار كرن شلوڤەبكەين ب شێوەيەكی قوتابی بشێت ب ساناهی مفایێ ژ تۆرا ئينتەرنێتێ وەربگريت.

**سایت Site :-** مەبەستا وێ دئینتەرنێتێدا کو (کۆمپانیەکێ یان دەزگەهەکی یان کەسەکی ) دروستکریە ب چەندین بەرپەڕان کو زانیارییێن جۆرا وجۆر یێن تایبەت ب ویڤە دناڤدانە ، ناڤ ونیشانەکا تایبەت هەیە و هەمی کەس د جیهانێدا دشێن سەرەدانا وێ بکەن و مفای ژێ وەربگرن.

**تێبینی :-**

هێمایا (**WWW**) ژڤان سێ پەیڤان هاتیە وەرگرتن

(World Wide Web )

رامانا وێ دزمانێ مەدا (تۆرا تەڤنپیرکا جیهانی).

# ڤەكرنا ئینتەرنێتێ

## بۆ ڤەكرنا ئینتەرنێتێ ڤان پێنگاڤان دێ بكارئینین:-

١- كلیككرن لسەر (Start).

٢- كلیككرن لسەر ( All Programs ).

٣- كلیككرن لسەر ( Internet Explorer ).

یان لسەر روویێ شاشێ (Desktop)ێ دوو كلیكان لسەر ئایكۆنێ ( ئینتەرنێت ئیكسپلورەر ) دكەین.

پشتی دەمەكێ كێم ژ چاڤەرێكرنێ پەنجەرا تایبەت ب ئینتەرنێتێ ڤه دهێتە ڤەكرن كو ژبلی شەریتێن كەرەستێن گشتی شەریتەكا كەرەستێن تایبەت ب نڤیسینا ناڤ ونیشانێن سایتی دناڤدایە ودبێژنێ Address.






پشتى چوونا دناڤ ئینتەرنێتێدا ودناڤ لاكێشا Addressدا دشیاندایە ناڤێ سایتێ مەبەست بنڤیسین.

پشتى نڤیسینا ناڤ ونیشانێن سایتى وبۆ ڤەكرنا سایتێ ئایكۆنێ Go كلیككە یان لسەر كیبۆردى دوگما Enter بكاربینە



## شەریتا کەرەستێن ستاندەرد Standard Toolbar




١- Back : پاشفەزڤرینا بەرپەرەکی .

٢- Forward : پێشڤەچوونا بەرپەرەکی.

٣- Stop : راوەستیان .

٤- Refreash : بۆ نووکرنە ڤەیا پێزانینێن سایتی.

٥- Home : زڤرین بۆ بەرپەرێ سەرەکی یێ سایتی.

٦- Search : بۆ لێگەریانێ.

٧- Favorites : لیستا ئەو سایتێن گەلەك دهێنە بکارئینان.

٨- History : بۆ بەرچاڤکرنا ئەو سایتێن بەری نۆکە هاتینە ڤەکرن.

٩- E-Mail : هنارتنا ئیمێلەکێ.

١٠- Print : چاپکرن.

١١- Microsoft Word : ڤەگوهاستنا سایتی بۆ بەرپەرەکێ پرۆگرامێ مایکرسۆفت وورد.

١٢- Messanger : بۆ گەنگەشەکرنێ

بڤی شێوەی وپشتی ڤەکرنا هەر سایتەکی وبۆ بکارئینانا وی مفا ژ ڤان ئایکۆنان دهێتە وەرگرتن بۆ مەبەستا ب ساناهیکرنا هاتن وچوونێ دناڤ بەرپەراندا وهەرووەسا بۆ چەند کارێن دی وەك (چاپکرن ، لێگەریان ، هنارتنا سایتی بۆ ناڤ لیستا سایتێن گرنگ ، ...هتد).

هەژی گوتنێیە کو بۆ نڤیسینا ناڤێ هەر سایتەکی پێدڤییە ئەڤ هەرسێ پشکە بهێنە دیار کرن.

www.ناڤێ سایتی .کورتیا سایتی

بۆ نموونە:-

www.kurdistantv.net
www.yahoo.com
www.kurdistan-moe.org

هتد.. هەر کورتیەکا سایتی رامانا خۆ یا تایبەت هەیە ،هەر وەکو دڤی خشتەیدا دیار.

| هێما | ناڤێ هێمای | کارێ وی |
|---|---|---|
| com | Commerical | تایبەتە ب کۆمپانیێن بازرگانی |
| edu | Education | تایبەتە ب بوارێ پەروەردێڤە |
| net | Network | تایبەتە ب تۆرا خزمەتگوزاریێڤە |
| gov | Government | تایبەتە ب جهێن میریڤە |
| mil | Militant | تایبەتە ب جهێن لەشکەریڤە |
| tv | Television | تایبەتە ب کەنالێن تەلەفزیۆنیڤە |
| org | Organization | تایبەتە ب رێکخراوێن تایبەت و نەحکومی |

## سایتێن کوردی

لڤێره ناڤ ونیشانێن چەند سایتێن کوردی وەك نموونە بۆ قوتابیێن خۆشتڤی بەرچاڤ دکەین داکۆ مفای ژێ وەربگرن. هەژی گوتنێیە کو ئەم کورد وەکو هەر نەتەوەیەکا دی شیاینە جهێ خۆ بکەین دناڤ جیهانا ئینتەرنێتێدا ب رێکا شارەزاییێن کورد دڤی بواریدا. دڤی خشتێ لخوارێ چەند نموونەکێن بچووك ژ ناڤ ونیشانێن سایتێن کوردی هاتینە دیارکرن.

| ناڤ ونیشانێن سایتی | تایبەتمەندی |
|---|---|
| www.kurdistantv.net | مالپەرێ تەلەفزیۆنا کوردستان یا ئاسمانی |
| www.kurdistan-moe.org | مالپەرێ وەزارەتا پەروەردێ |
| www.rojnamawar.com | مالپەرێ رۆژناما وار |

## چاوانیا ڤەگرتنا وێنەیەكی ژ ئینتەرنێتێ

دناڤ تۆرا ئینتەرنێتێدا گەلەك جاران ئەم پێدڤی ڤەگرتنا یان چاپكرنا وێنەیەكینە ، دبیت وێنە بتنێ نەبیت بەلكۆ دگەل نڤیسینەكێدابیت وئەم بتنێ پێدڤی وێنەینە، دناڤ ئینتەرنێتێدا وبۆ ڤەگرتنا ڤان جۆرە وێنان چەندین رێك هەنە ژوان:-

### رێكا ئێكێ:-



ئایكۆن

دەمێ نیشاندەرێ ماوسی بكەڤیتە لسەر وێنەی ئێكسەر چوار ئایكۆن بەرچاڤدبن لسەرێ وێنەی و ل لایێ چەپێ وئەڤ ئایكۆنە بڤێ شێوەینە:-

١- فلوپی دیسك :- بكلیككرنێ وێنە دهێتە ڤەگرتن دناڤ درایڤەكێ كۆمپیۆتەریدا.

٢- ئامیرێ چاپكرنێ :- بكلیككرنێ وێنە دهێتە چاپكرن.

٣- نامەیەك :- بۆ هنارتنا وێنەی بۆ ئیمێلا خۆ یان بۆ هەر كەسەكێ دی.

٤- فولدەر :- بۆ ڤەگرتنا وێنەی دناڤ فولدەرەكێ تایبەت ب وێناندا.

## رێکا دووێ:-



بکلیککرنا راستێ لسەر وێنێ مەبەست لیستەکا کورت بەرچاڤدبیت وژڤان فەرمانان پێکهاتیە:-

١- Save Picture as:-ب رێکا ڤێ فەرمانێ دشێین وێنەی ڤەگرین دناڤ هەر درایڤەکێ کۆمپیۆتەریدا.

٢-E-mail Picture:- بکلیککرنێ دشێین وێنەی بهنێرین بۆ ئیمێلەکا مەبەست.

٣-Print Picture:- بۆ چاپکرنا وێنەی.

٤-Go to My picture:- بۆ هنارتنا وێنەی بۆ فولدەرێ (My Picture).

٥-Set As Background:-بکلیککرنا ڤێ فەرمانێ وێنە لسەر روویێ شاشێ دەردکەڤیت.

٦-Set As Desktop Item:-بۆ برنا وێنەی بۆ سەر دێسك تۆپی.

٧-Copy:- بۆ کۆپیکرنا وێنەی.

٨-Add to Favorites:- بۆ هنارتنا وێنەی بۆ دناڤ لیستا سایتێن گەلەك دهێنە بکارئینان.

## لێگەڕیان دناڤ ئینتەرنێتێدا( Search )

بکارئینانا دووێ یا ئینتەرنێتێ پێکدهێت ژ کریارا لێگەڕیانێ (Search) ، کو بڤێ رێکێ گەلەك ب ساناهی و دەمەکێ کێمدا مفایەکێ زۆر ژ زانیاریێن ڤێ تۆرێ دهێنە وەرگرتن، ژبەر پرانیا زانیاریێن ب مفا دناڤ ئینتەرنێتێدا وبۆ گەهشتنەکا بلەز بۆ هەر زانیاریەکا مەبەست پێ چەند سایتەکێن گرنگ هەنە ب کارێ لێگەڕیانێ رادبن ژوانان:-

www.google.com
www.yahoo.com
www.ask.com
www.altavista.com
www.msn.com







لێ سایتێ ژ هەمیان گرنگتر وبەربەلاڤتر ب تایبەتمەندیا لێگەڕیانێ سایتێ (www.google.com) ە.

ئارمانجا گوگلی پێشکێشکرنا باشترین خزمەتێن گۆزاریە و دهێتە هژمارتن وەك بلـەزترین سایتێ لـێگەڕیانێ ، کو دماوەیەکێ گەلـەك کێمدا ئەنجامێن لـێگەڕیانێ بەرچاڤدکەت ، بۆ مفا وەرگرتن ژڤی سایتێ ب ناڤ و دەنگ رۆژانە چەندین کەس سەرەدانا وێ دکەن.

هزرا دروستبوونا ڤی سایتی دزڤڕیت بۆ دوو قوتابیێن خواندنا باوەرناما دکتورایێ ب ناڤێن ( **لاری بایج وسیرغی برین**) ل زانکۆیا (**ستافوێرد**) کو ب (**٢٥**) مەلیۆن دولاران ئەو کۆمپانیە هاتە دامەزراندن وئەڤ پارە ژلایێ سێ کومپانیاڤە هاتبوو تەرخانکرن.

ئەڤ سایتە ب شێوەیەکێ ئوتۆماتیکی و بابەتی کارێ لـێگەڕیانێ ئەنجامددەت.

## لێگەڕیان دناڤ سایتێ گوگلیدا بڤی شێوەی دهێتە ئە نجامدان

دەمێ تە بڤێت دەربارێ بابەتەکی بخوینی یان لـێبگەڕی، دڤێت نڤیسینا مەبەست پێ بهێتە نڤیسین دناڤ بۆشاتیا هاتیە دانان بۆ ڤێ مەبەستێ و کلیکێ لـسەر (**Google Search**) بکە ، پشتی دەمەکێ کێم ژ چاڤەرێکرنێ ژمارەکا ناڤ ونیشانێن سایتا کو ئەو نڤیسینا مەبەست دناڤدا هەیە بەرچاڤ دبن وبکلیککرنێ لـسەر ناڤێ هەر سایتەکێ مالپەرێ وێ ڤەدبیت.

ستافێ گوگل ژ (٦) ئەندامێن سەرەکی پێکدهێت وئێك ژڤان ئەنداما کوردە وناڤێ وی (ئومێد)ە.

لێگەریان دناڤ سایتێ گوگلیدا ب (١٠١) زمانایه وئێك ژوان زمانان (زمانێ کوردی)یه کۆ تازه هاتیه دامەزراندن، ولدووڤ حەزا مه دشیاندایه زمانێن مەبەست هەلبژێرین.



بۆ گوهۆرینا زمانێ دهێته بکارئینان کلیکێ لسەر (Language Tools) دکەین بەرپەرەك بەرچاڤدبیت کۆ پێکدهێت ژ (١٠١) زمانان. بۆ نموونه ئەگەر تەبڤێت لێگەریان ب زمانێ عەرەبی بیت کلیکێ لسەر (Arabic) بکه ، بەرپەرێ گوگلی دهێته گوهۆرین بۆ زمانێ عەرەبی.



یان ب رێکا کلیککرنا ئالایێ وەلاتێ مەبەست پێ ئێکسەر گوگل ب زمانێ وی وەلاتی بەرچاڤدبیت.

# دروستکرنا ئیمێلێ E-mail

وەکو لبەراهیکێ ئاماژە پێ هاتیە کرن کۆ گرنگترین کارێ سیێ یێ ئینتەرنێتێ پۆستا ئەلکترۆنیە (E-mail).

پۆستا ئەلکترۆنی دهێتە بکارئینان بۆ هنارتن و وەرگرتنا نامان ونڤیسینان و وێنا ب رێکا ئینتەرنێتێ وبکارئینانا ئیمێلەکا تایبەت کو ب رێکا سایتەکی هاتیە دروستکرن.

ئەم دشێین د ناڤ زۆربەیا سایتاندا ناڤونیشانێن ئەلیکترۆنی دروستبکەین و زۆربەیا وان بۆ ئەنجامدانا دروستکرنا ئیمێلی نێزیکی ئێکن بەلکو دشیاندایە بێژین وەکهەڤن. لێ سایتێن ب ناڤودەنگ دجیهانێدا بۆ بکارئینان و دروستکرنا پۆستێن ئەلیکترۆنی E-mail هەردوو سایتێن (Yahoo و Hotmail)ن وهەروەسا دهێنە هژمارتن وەك بهێزترین سایتێن خزمەتگۆزاریێ. ولڤێرێ وەك نموونە بۆ دروستکرنا ئیمێلەکێ دێ سایتێ Yahoo وەرگرین.

## چاوانیا دروستکرنا پۆستەکێ ئەلیکترۆنی (E-mail) دناڤ سایتێ (Yahoo) دا

١-پشتی چوونا دناڤ پەنجەرا ئینتەرنێتێدا ( Internet Explorer)دناڤ لاکێشا (Address)دا بنڤیسە (www.yahoo.com) وئایکۆنێ **Go** کلیکبکە یان دوگما **Enter** لسەر کیبۆردی بکاربینە.

٢-پشتى سايتێ (yahoo) دهێتە ڤەكرن وەكو د وێنەيدا ديار ، كليكێ لسەر **Yahoo Mail** بكە




٣-دناڤ پەنجەرەكا نوو دا بۆكسەك بەرچاڤدبيت ، دوگما ( **Sign Up for Yahoo**) كليكبكە.

٣

Don't have a Yahoo! ID?
Signing up is easy

Sign up for Yahoo!

Already have a Yahoo! ID?
Sign in

Are you protected?
Create your sign-in seal. (Why?)

Yahoo! ID

(e.g. free2rhyme@yahoo.com)

Password

☐ Keep me signed in
for 2 weeks unless I sign out Info
[Uncheck if on a shared computer]

Sign In

I can't access my account | Help

One Yahoo! ID. So much fun!
Use your single ID for everything from checking Mail to checking out Yahoo! Music, Flickr, Messenger, and more.

٤-فۆرمەك دهێتە بەرچاڤكرن بۆ تۆماركرنا پێزانینێن تایبەت ب دروستكرنا ئیمێلیَ. ئەڤ فۆرمە پێكهاتیە ژ چەندین خانان كو پێدڤییە بهێنە داگرتن و بڤی شێوەی.

YAHOO! — Yahoo! | Help

Get a Yahoo! ID and free email to connect to people and info that you care about.

Name
Gender - Select One -
Birthday - Select Month -
Country Iraq

**Select an ID and password**

Yahoo! ID and Email @ yahoo.com Check
Password — Password Strength
Re-type Password

**In case you forget your ID or password...**

Alternate Email
Secret Question 1 - Select One -
Your Answer
Secret Question 2 - Select One -
Your Answer

Type the code shown — Need audio assistance ?
pzByAs3
Try a new code

By clicking the "Create My Account" button below, I certify that I have read and agree to the Yahoo! Terms of Service, Yahoo! Privacy Policy and Mail Terms of Service, and to receive account related communications from Yahoo! electronically.

Create My Account

أ. **First Name**:- نڤیسینا ناڤیَ ئێكیَ یێ پشكداری.

ب. **Last Name** :- نڤیسینا ناڤیَ دوماهیكیَ (باب یان باپیر).

ج. **Gender** :- بۆ دیاركرنا رەگەزیَ پشكداری (نێر Male ، میَ Female).

د. Birthday:- دیارکرنا ژدایك بوونا پشکداری (هەیڤ – رۆژ – ساڵ)

ه. Country:- دیارکرنا ناڤێ وەلاتی.

و. Yahoo ID and E-mail:- نڤیسنا ناڤەکی کو دبیتە ناڤونیشانێن پۆستا ئەلیکترۆنی. دشیاندایە ناڤێ ئێکێ و دوماهیکێ بنڤیسی یان ناڤێ خۆ وژمارەکێ یان هەر ناڤەکێ مە بڤێت ولدووڤ حەزا مە لێ ب مەرجەکی ئەڤ ناڤە کەسەکێ دی بکارنەئینابیت.

ز. Passward:- بۆ نڤیسینا پەیڤەکا نهێنی بۆ ڤەکرنا ئیمێلێ ، ئەڤ پەیڤە چێدبیت ژمارە بن یان پیت بن یان پیت وژمارەبن ب مەرجەکی ژ شەشا کێمتر نەبن.

ح. Re-type Passward:- دووبارەکرنا نڤیسینا پەیڤا نهێنی ب هەمان شێوێ هاتیە نڤیسین د خالا (ز)دا.

گ.Alternate E-mail:-هنارتنا پێزانینێن ڤێ فۆرمێ بۆ ئیمێلەکا کەڤن (ئەڤ خانە مەرج نینە بهێتە داگرتن).

ی. Secret Question١:-کۆمەڵەکا پرسیارێن ئامادەکرینە لدووڤ حەزا خۆ دێ هەلبژێرین وبەرسڤەکێ لسەر ددەین دناڤ خانا ( Your Answer )دا.

ك. Secret Question٢:-کۆمەڵەکا دییە ژپرسیارێن ئامادەکری لدووڤ حەزا خۆ دێ هەلبژێرین وبەرسڤەکێ لسەر دەین دناڤ خانا ( Your Answer )دا.

ل. Type the code shown:- دهێتە بکارئینان بۆ نڤیسینا وان پیتێن هاتینە دیار کرن دناڤ وێنێ هاتیە بەرچاڤکرن لدوماهیا فورمێ.

م. Create My Account:- بکلیککرنا ڤێ دوگمێ هووربینکرنەك لسەر پێزانینێن هاتینە داگرتن دهێتە کرن ، ئەگەر هەمی پێزانین دروستبن ئێکسەر ئیمێلەك

(پۆستەکا ئەلیکترۆنی) دناڤ سایتێ yahoo دا دهێتە دروستکرن.

تێبینی / نڤیسینا هەر ئێمێلەکی بڤێ شێوەیە.

کورتیا سایتی.ناڤێ سایتی@ناڤونیشان

بۆ نموونە

zaneen@yahoo.com
pola_heshte@yahoo.com
dohuk_edu@kurdistan-moe.org
rangeen_1992@hotmail.com
silav_silav@gmail.com

# چاوانیا ڤەکرنا ئیمێلێ و هنارتنا نامەیەکا ئەلیکترۆنی

## ڤەکرنا نامەی :-




لـدەسپێکێ دناڤ سایتێ yahoo دا کلیکێ لسەر Yahoo Mail دکەین، بۆکسەك دهێتە بەرچاڤکرن کۆ دناڤ خانا (Yahoo ID) دا ئەوو ناڤێ ل پێش (@) دێ نڤیسین بۆ نموونە .

zaneen
pola_heshte
dohuk_edu
rangeen_1992
silav_silav

Don't have a Yahoo! ID?
Signing up is easy.
Sign up for Yahoo!
Already have a Yahoo! ID?
Sign in
Are you protected?
Create your sign-in seal. (Why?)
Yahoo! ID:
(e.g. free2rhyme@yahoo.com)
Password:
Keep me signed in
for 2 weeks unless I sign out Info
[Uncheck if on a shared computer]
Sign In
I can't access my account | Help
One Yahoo! ID. So much fun!
Use your single ID for everything from checking Mail to checking out Yahoo! Music, Flickr, Messenger, and more.

دناڤ خانا (Passwward)دا پەیڤا نهێنی دێ نڤیسین وئەڤ پەیڤە ب شێوێ هێمایەکی بەرچاڤدبیت وەك (* ، ●، ..هتد). پاش کلیکێ لسەر (Sign In) دکەین یان ب رێکا کیبۆردی دوگما Enter دێ بکارئینین. د دووڤدا ئەڤ بۆکسە بەرچاڤدبیت.

ئەگەر مەبقێت نامێن بۆ مە هاتین ڤەکەین ، جارا ئێکێ دێ (Inbox) کلیککەین د دووڤدا کلیکێ لسەر (Subject) ا نامەیێ دکەین پشتی دەمەکێ کێم ناڤەرۆکا نامەی دهێتە بەرچاڤکرن. لێ ئەگەر مە بڤێت نامەیەکێ یان زێدەتر ژێببەین بەرامبەری ناڤونیشانێن نامێ چوار گوشەکا هەلبژارتنێ هەیە ، وێ چوار گوشێ دەست نیشاندکەین و کلیکێ لسەر دوگما (Delete) دکەین.



دناڤ (Inbox)دا پێزانینێن نامێن هاتینە وەرگرتن ژڤان پشکا پێکدهێن:-

**Sender**:- ناڤونیشانێن ئەو ئیمێلا نامە رەوانەکری.

**Subject**:-بابەتێ نامێ.

**Date**:- مێژوویا هنارتنا نامێ.

**Size**:- قەبارێ نامێ.

## هنارتنا نامان (ئیمێل).

بۆ هنارتنا ئێمێلەکێ کلیکێ لسەر (New) دکەین پشتی دەمەکێ کێم لیستەك بەرچاڤدبیت دناڤدا کلیکێ لسەر (New Message) دکەین ، بۆکسەك بەرچاڤدبیت کو ژڤان پشکا پێکهاتیە :-



- **To** :- نڤیسینا ئیمێلا وی کەسێ نامە بۆ دهێتە هنارتن.

- **Add CC**:- هنارتنا هەمان نامێ بۆ چەند کەسێن دی وئیمێلێن وان لـدەڤ کەسێ ئێکێ ئەوێ دپشکا (To)دا هاتیە نڤیسین بهێنە دیارکرن.
- **Add BCC**:- هنارتنا هەمان نامێ بۆ چەند کەسێن دی لێ ئیمێلێن وان لـدەڤ کەسێ ئێکێ ئەوێ دپشکا (**To**)دا هاتیە نڤیسین نەهێنە دیارکرن.
- **Subject**:- بابەتێ سەرەکی یێ ئیمێلێ.

پشتی دیار کرنا ڤان پشکا و دناڤ لاکێشا نڤیسینێدا نامە دهێتە نڤیسین ، ولـدوماهیێ بۆ هنارتنا نامێ دوگما (**Send**) دهێتە کلیککرن.

ئەگەر نامە هاتە هنارتن ئاگەهداریا مە دهێتە کرن کۆ نامە هاتە هنارتن بۆ ئەو کەسێن ئیمێلێن وان هاتینە نڤیسین دناڤ پشکێن (**To**، **Add CC** ، **Add BCC**)دا

**Message Sent To**

ئەگەر نامە نەهاتە هنارتن ئاگەهداریا مە دهێتە کرن ب رێکا نامەیەکێ ژ کارگێریا سایتی بۆ پۆستا مە ، ئەگەرێ نەهنارتنا هەر نامەیەکێ دزڤریت بۆ شاشیێن نڤیسینا ناڤونیشانێن ئیمێلا.

ئەگەر مەبڤێت ئەو ئیمێلێن مە نامە بۆهنارتین ڤەگرین دناڤ Address Book دا کلیکێ لسەر Add to Address Book دکەین.

# چاوانیا هنارتنا هەڤپێچەکێ دگەل نامێدا

چەند جاران پێدڤیە دگەل نامێدا وێنەیەك یان هەڤپێچەك بهێتە هنارتن، بۆ ئەنجامدانا ڤی کاری دوگما (**Attach File**) کلیکدکەین د دووڤدا بۆکسەك دهێتە ڤەکرن کلیکێ لسەر دوگما (**Browse**) دکەین. بۆکسەکا دی بەرچاڤدبیت دناڤدا جهێ فایلێ هەڤپێچ دیاردکەین (درایڤ+فولدەر) وکلیکێ لسەر دوگما (**Open**) دکەین، دگەل نامێدا ئەگەر ژمارا فایلێن هەڤپێچ ژ فایلەکی زێدەتربن جارەکا دی دوگما ( **Browse** ) کلیکدکەین وفایلەکێ دی دەست نیشاندکەین و..هتد. پشتی دیار کرنا فایلێن هەڤپێچ جارەکا دی کلیکێ لسەر دوگما (**Attach File**) دکەین، لڤێرێ داگرتن و پشکنینا فایلێن هەڤپێچ دێ هێتە کرن و پشتی ئەڤ کارە دهێتە ئەنجامدان کلیکێ لسەر دوگما ( **Add to Message** ) دکەین وئەگەر ناڤرۆکا نامێ وئیمێلێن بۆ دهێنە هنارتن هاتبنە دیار کرن ئێکسەر دوگما (**Send**) کلیکدکەین ئەڤجا نامە دگەل هەڤپێچیا دهێتە هنارتن.







# هنارتنا كارتان دگەل نامێدا (ئیمێلێدا)

گەلەك جاران و لدەمێ هنارتنا نامەیەكێ بۆ هەڤالەكێ و وەكو بیرئانینا بیرەوەریەكێ كارتەكا تایبەت ب وێ بیرەوەریێ دگەل نامێدا




دهێتە هنارتن، بۆ ڤێ مەبەستێ سایتێ (yahoo) گەلەك كارت ئامادەكرینە وبۆ هەر بیرەوەریەكێ كارتێن تایبەت هاتینە ئامادەكرن. زۆربەیا كارتان پارچەكا موسیقێ دگەلدایە.






دناڤ سایتێ (yahoo)یدا وبۆ هنارتنا كارتەكێ بۆ هەڤالەكێ ، لدەسپێكێ هەرە دناڤ ئیمێلا خۆدا د دووڤدا كلیكێ لسەر (Compose) بكە ، بۆكسەك بەرچاڤدبیت ، ل لایێ راستێ هاتیە نڤیسین (Send an eCard) ئانكو هنارتنا كارتەكا ئەلیكترۆنی ، بكلیككرنا ڤێ نڤیسینێ دێ بەرپەرێ (yahoo Greeting)

هێتە ڤەکرن کۆ کۆمەکا زۆر ژ کارتێن بیرەوەریان هاتینە ئامادەکرن.







Thank You for Your Friendship




A Simple Thank You




For Everything You've Done

بۆ نموونە کلیکێ لسەر (Thank you) بکە کۆمەکا کارتێن تایبەت ب سوپاسیانڤە دهێنە بەرچاڤکرن ولدووڤ حەزا مە دشیاندایە کارتەکێ کلیککەین وێنە دهێتە بەرچاڤکرن ، د دووڤدا کلیکا راستێ لسەر وێنەی بکە لیستەکا کورت بەرچاڤدبیت دناڤ ڤێ لیستێدا فەرمانێ (Save picture As) کلیککە ، وێنەی ڤەگرە ب ناڤەکێ دناڤ درایڤەکیدا یان فولدەرکیدا.

د دووڤدا ودناڤ ئیمێلێدا ب رێکا هەڤپێچ کرنا فایلەکێ ( Attach File) وێنێ هاتیە ڤەگرتن بهنێرە.

## چاوانیا گوهۆڕینا پەیڤا نهێنی (Change Passward)

گەلەك جاران پێدڤییە پەیڤا نهێنی یا ڤەکرنا ئیمێلی (Passward) بهێتە گوهۆڕین ژ ئەگەرێ ئاشکرابوونا پەیڤێ یان ژی ژبەر هەر ئەگەرەکێ دی . دناڤ سایتێ yahoo دا گوهۆڕینا پەیڤا نهێنی بڤی شێوەی یە.

١-لدەسپێکێ ئیمێلێ ڤەکە

٢- Option کلیکبکە.

٣-د دووڤدا Account Information کلیکبکە . بۆکسەك بەرچاڤدبیت دناڤ بۆشاتیا (Passward) پەیڤا نهێنیا کەڤن بنڤیسە وکلیکێ لسەر (Sign In) بکە.

٤-فۆرمەکا دی بەرچاڤدبیت دناڤ ڤێ فۆرمێدا ( Change Passward) کلیکبکە.

٥-بۆکسەکا دی بەرچاڤدبیت کۆ ژ سێ بۆشاتیا پێکدهێت.

أ. دناڤ ڤالاهیا ئێکێ (Enter Current Passward) پەیڤا نهێنیا کەڤن بنڤیسە.

ب. دناڤ ڤالاهیا (Choose New Passward) پەیڤا نهێنیا نوو بنڤیسە.

ج. دناڤ ڤالاهیا ( Confirm your New Passward) دووبارە پەیڤا نهێنیا نوو بنڤیسە.

پاشی دوگما (Save) کلیکبکە د دووڤدا دهێتە راگەهاندن کو پەیڤا نهێنی هاتە گوهۆڕین.

## گەنگەشەكرن (Chat)

گەنگەشەكرنا زێندی ئێك ژ مفایێن هەرە گرنگە یێن بكارئینانا ئینتەرنێتێ . لڤێرێ مە دڤێت ئاماژێ بگەنگەشەكرنێ دناڤبەرا دوو كەساندا یان زێدەتر ب رێكا نڤیسینێ یان بنڤیسینێ و دەنگی یان بنڤیسینێ ودەنگی و وێنەی بكەین.

## جۆرێن سەرەكی یێن گەنگەشەكرنێ

جۆرێ ئێكێ :- گەنگەشەكرن دگەل كەسێن نیاس وهەڤالان كو هەڤنیاسینەك دناڤبەرا وان پەیدابوویە وگەنگەشا وان دبوارێن تایبەتدا دبن.

جۆرێ دووێ :- گەنگەشەكرن دناڤ ژۆرێن گەنگەشكرنێدا لسەر بابەتەكی دهێتە دیار كرن كۆ هەر رۆژەكێ یان هەر دەمەكی بابەت دهێتە گوهۆرین ، دڤی جۆرێ گەنگەشێدا مەرج نینە هەڤنیاسینەك دناڤبەرا پشكداران هەبیت و هەمی كەس دشێن پشكداریێ دگەنگەشێدا بكەن.

سایت و پرۆگرامێن تایبەت ب گەنگەشەكرنێ گەلەكن ، لێ یێن ژ هەمیان بەربەلاڤتر ئەڤەنە:-

(Yahoo Messanger , Msn Messanger , Paltalk Messanger)

ئەڤە ژبلی چەندین سایتێن تایبەت بگەنگەشەكرنێ وەك ( Kurd Chat،...هتد). لڤێرێ پرۆگرامێ یاهو مەسنجەر Yahoo Messanger وەك ب ساناهیترین نموونە ژ پرۆگرامێن گەنگەشەكرنێ وەردگرین.

لدەسپێكێ بۆ بدەستڤەئینانا پرۆگۆامێ Yahoo Messanger دشێین ب رێكا سی دی (CD)یەكێ پرۆگرام دناڤدا یان ئێكسەر ب رێگا سایتێ yahoo پرۆگرامێ داونلود (Download) دكەین بڤی شێوەی:-

پشتی ڤەکرنا سایتیَ yahoo کلیکیَ لسەر Messanger دکەین د دووڤدا چەند پێنگاڤێن بارکرنا (داونلودکرنا) پرۆگرامی دیَ بکارئینین.

دناڤ کۆمپیوتەریدا پرۆگرام هاتە ئامادەکرن ، وەك تێبینی ئەڤ پرۆگرامە دهێتە بکارئینان بۆ گەنگەشەکرنیَ بتنیَ دناڤبەرا وان ئیمێلێن هاتینە دروستکرن ب رێکا سایتیَ (yahoo) یدا.

## ڤەكرنا پرۆگرامىٚ Yahoo Messanger وبكارئينانا وى

ژبۆ ڤەكرنا پرۆگرامىٚ ياهوو مەسنجەر (Yahoo Messanger)ى ڤان پێنگاڤان بكاربينە :-




١- كليككرن لسەر Start.

٢-هەلبژارتنا All Programs.

٣-هەلبژارتنا Yahoo Messanger و كليككرنا Yahoo Messanger.

يان ب ئێك پێنگاڤ ب رێكا جووت كليككرن لسەر ئايكۆنىٚ پرۆگرامىٚ Yahoo Messanger لسەر دێسك تۆپى.

بڤىٚ چەندىٚ پرۆگرامىٚ Yahoo Messanger دهێتە ڤەكرن كۆ پێكهاتيە ژ دوو ڤالاهيان :-

أ- **Yahoo ID** :- بۆ نڤيسينا لبەرى (@) يا ئيمێلىٚ.

ب-**Passward**:- نڤيسينا پەيڤا نهێنيا ئيمێلىٚ.

پشتى داگرتنا هەردوو ڤالاهيان دوگما (**Sign In**) كليكدكەين وپشتى دەمەكىٚ كێم پەنجەرا پرۆگرامىٚ Yahoo Messangerدهێتە ڤەكرن كۆ يا تايبەتە ب ئيمێلا هاتيە داگرتن.

ئەگەر تە بڤێت ئيمێلا هەڤالەكى زێدەبكەى دناڤ ليستا (Contact)دا كليكىٚ لسەر (Add Contact) بكە بۆكسەك بەرچاڤدبيت دناڤ ڤالاهيا :-

## Type the person's yahoo ID or E-mail address

ئیمێلا وی هەڤالی یان نڤیسینا لبەری هێمایی (@) بنڤیسە د دووڤدا کلیکێ لسەر (Next) بکە ، بۆکسەکا دی بەرچاڤدبیت لڤێرێ بتنێ کلیکێ لسەر (Next) بکە ولدوماهیێ دوگما (Finish) کلیکبکە. بڤێ چەندێ نامەیەك دهێتە هنارتن بۆ وی هەڤالی ولدووڤ رەزامەندیا وی لسەر ڤێ نامێ ئەو هەڤالە دهێتە زێدەکرن.

هەر دەمەکێ ئەو هەڤالە لسەر هێلا Yahoo Messanger بیت هێمایەکێ زەر تەنشت ئیمێلێ وی دیار دبیت وناڤێ وی تۆخدبیت. وبۆ پەیوەندیکرنێ دگەل وی هەڤالی جووت کلیکا لسەر ناڤێ وی بکە بۆکسەکا تایبەت ب گەنگەشەکرنێ ڤەدبیت دناڤدا نڤیسینا خۆ بنڤیسە د دووڤدا کلیکێ لسەر (Send) بکە یان دوگما (Enter) بکاربینە ئەو نڤیسینە دێ هێتە هنارتن بۆ وی هەڤالی د دووڤدا چاڤەرێی بەرسڤا وی بکە. ژبۆ گەنگەشکرنێ ب رێکا دەنگی یان ب دەنگێ وکامیرێ کلیکێ لسەر ئایکۆنێ (Call) و ئایکۆنێ (Webcam) بکە.

بۆ گەنگەشەكرنێ دناڤ ژۆرێن گەنگەشێدا دەسپێكێ پشتی ڤەكرنا یاهو مەسنجەری كلیكێ لسەر ئایكۆنێ Chat بكە د دووڤدا ناڤێن بابەتان بەرچاڤدبیت كۆ جۆرێن ژۆران دیار دكەن بۆ نموونە ئەو ژۆرێن بەحسێ خواندنێ و پەروەردەكرنێ دناڤ قوتابخانێدا دكەن ، یان ئەو ژۆرێن بەحسێ كارێن دارایی دكەن ، یان ....هتد. بابەتەكی هەلبژێرە و جووت كلیكا لسەر جۆرێ ژووری بكە بۆكسەك بەرچاڤدبیت دناڤدا (Enter Chat) كلیكبكە ، پشتی دەمەكێ كێم پەنجەرا ژووری دهێتە




ڤەكرن د دووڤ حەزا خۆ جووت كلیكا لسەر ئێك ژوان ئیمێلێن بەرچاڤ بكە و گەنگەشێ دگەلدا بكە.




بۆ گرتنا پرۆگرامی و دەركەفتن ژ گەنگەشێ لیستا Messanger ڤەكە وفەرمانێ (Sign Out) كلیكبكە د دووڤدا كلیكێ لسەر (Close) بكە.

# وەرگرتنا زانیاریێن سەقای

مفایەکێ دی ژ ئینتەرنێتێ وەرگرتنا زانیاریێن سەقایە و بۆ ڤێ چەندێ چەندین سایت هەنە ، وەك نموونە سایتێ:-

www.wunderground.com

گرنگیا ڤی سایتی ئەوە کو دشێت سەقایێ رۆژ و شەڤان بۆ ماوێ (٧) رۆژان (حەفتیەکێ) دیاربکەت وبڤی شێوەی:-




١- دناڤ ڤالاهیا Adress دا ناڤێ سایتێ بنڤیسە

www.wunderground.com

وکلیکێ لسەر ( Go) بکە یان دوگما (Enter)بکاربینە

٢- دناڤ خانا

**Find the weather for any city state or ZIP code or Airport code or country**

ناڤێ وەلاتی یان ناڤێ بازێری یان کودێ وەلاتی یان کودێ فرۆکخانا وەلاتێ تە بڤێت سەقایێ وێ بزانی بنڤیسە، بۆ نموونە ئەگەر مەبڤێت سەقایێ عیراقێ بزانین دناڤ ڤێ خانێدا دی نڤیسین

(Iraq) وكليكىَ لسەر (**Fast Forecast**) دكەين يان دوگما (Enter) بكاردئينين.

٣- بەرپەرەكىَ دى بەرچاڤدبيت دناڤدا ناڤێن باژێرێن وى وەلاتى بەرچاڤدبن وبۆ زانينا سەقايىَ هەر باژێرەكى بتنىَ ناڤىَ وى كليكدكەين.


Wednesday
Scattered Clouds. High: 17 °C . Wind ENE 10 km/h .


Wednesday Night
Overcast. Low: 9 °C . Wind ENE 10 km/h .


Thursday
Partly Cloudy. High: 17 °C . Wind SE 14 km/h .


Thursday Night
Chance of a Thunderstorm. Partly Cloudy. Low: 10 °C . Wind East 18 km/h . Chance of precipitation 30% (water equivalent of 0.67 mm).


Friday
Chance of a Thunderstorm. Partly Cloudy. High: 14 °C . Wind SSE 14 km/h . Chance of precipitation 40% (water equivalent of 6.84 mm).


Friday Night
Scattered Clouds. Low: 6 °C . Wind NE 10 km/h .


Saturday
Clear. High: 16 °C . Wind SW 10 km/h .


Saturday Night
Scattered Clouds. Low: 5 °C . Wind NE 7 km/h .


Sunday
Chance of Rain. Partly Cloudy. High: 15 °C . Wind South 10 km/h . Chance of precipitation 30% (water equivalent of 0.35 mm).


Sunday Night
Chance of Rain. Overcast. Low: 8 °C . Wind East 14 km/h . Chance of precipitation 40% (water equivalent of 6.04 mm).


Monday
Chance of Rain. Partly Cloudy. High: 12 °C . Wind West 18 km/h . Chance of precipitation 30% (water equivalent of 2.16 mm).


Monday Night
Clear. Low: 3 °C . Wind NNE 10 km/h . Windchill: 0 °C .


Tuesday
Chance of Rain. Partly Cloudy. High: 12 °C . Wind SSE 10 km/h . Chance of precipitation 20% (trace amounts).


Tuesday Night
Chance of Rain. Partly Cloudy. Low: 6 °C . Wind ENE 7 km/h . Chance of precipitation 20% (trace amounts).

# ڤایرۆسێ کۆمپیۆتەری Computer Virus

لدەمەکی کۆ کۆمپیۆتەر وئینتەرنێت بووینە پێدڤییەکا رۆژانە و تێکەلبوویە دگەل ژیانا مرۆڤیدا و ل زۆربەی وارێن ژیانێدا جهێ خۆ گرتیە، لێ یا سەیرە کو مفا وەرگرتن ژڤێ تەکنلوژیایێ بێ دەردوبەلا نینە و چەندین کەسێن شارەزا هەنە دبوارێ کۆمپیۆتەریدا پیلانا ددانن ژبۆ تێکدان و ژکارکەفتنا کۆمپیۆتەران.

ڤایرۆسێ کۆمپیۆتەری نە زیندەوەرەکە بچیتە دناڤ ئامیریدا وتووشی نەخۆشیەکێ بکەت بەلکۆ پرۆگرامەکە هاتیە دروستکرن ژبۆ ژکارکەفتنا سیستەمێ کۆمپیۆتەری وڤایروس کارێ خۆ دکەت لدەمێ کۆمپیۆتەر یێ ڤەکری بیت ، کارێ ڤایرۆسی مەرج نینە کۆمپیۆتەری ژکاربێخیت بەلکو هندەك جاران دبیتە ئەگەرەك بۆ ژێبرنا هندەك فایلێن جۆرا وجۆرێن پرۆگراما یان دبیتە ئەگەرەك بۆ بارگرانیا سیستەمێ کۆمپیۆتەری و...هتد.

لدووڤ راپۆرتەکا کۆمپانیا (سوفوس) بۆ دروستکرنا پرۆگرامێن بەرەڤانیکرنێ ژ ڤایرۆسان دسالێن بووریدا ژمارەکا زۆر ژ ڤایرۆسان بەلاڤکرینە ، بۆ نموونە ل سالا (٢٠٠١)ێ دا ژمارا ڤایرۆسان (١٢٠٠٠) هزار بوون، بەربەلاڤبوونا ڤایرۆسێ Nimda ل پێشیا هەمی ڤایرۆسان دهات ژبلی ڤایرۆسێ Sirеam. گەلەك ژڤایرۆسان ب ناڤێن




هونەرمەندێن سینەمایێ یان ب ناڤێ یاریکەرێن ب ناڤودەنگ یان ب ناڤێ (ئەز حەز ژ تە دکەم I Love You) ...هتد ئەڤە چەند جۆرن

ژ ڤایروٚسێن بناڤ ودەنگن کو ب رێکا ئینتەرنێتێ دکەڤنە کۆمپیۆتەریدا.

پرسیارا سەیر ئایا ئەگەر چییە لسەر دەمێ کۆمپیۆتەری وئینتەرنیتیدا چەند کەسانەك هەبن دەمێ خۆ تەرخان بکەن بۆ دروستکرنا ئاستەنگا بەرامبەری ڤێ زانستێ یان ژی پەیوەندی هەبیت ب هندەك کۆمپانیاڤە وژبەر مفایەکێ مادی یێ تایبەت ڤایرۆسان ب رێکا ئینتەرنێتێ و فلوپی و فلاش دێسك و سی دی یا بەلاڤدکەن.



چێدبیت دناڤ کۆمپیۆتەریدا پرۆگرامێ ئەنتی ڤایروٚس (Anti Virus) یێ نوو هەبیت ژبۆ بەرگریکرن و دوورئێخستنا کۆمپیۆتەری ژ زیانێن ڤایرۆسی.

# راهێنان

## لایێ تیوری

پ١/ جۆرێن سەرەکی یێن گەنگەشێ شلۆڤەبکە .

پ٢/ مفا وەرگرتن ژڤان ئایکۆنان چیە.

Forward-١ Refreash-٢ Search-٣

## لایێ پراکتیکی

پ١/ئیمێلەکێ ب ناڤێ خۆ دروستبکە دناڤ سایتێ (**Yahoo**)دا.

پ٢/ئیمێلەکێ (نامەیەکێ) بۆ هەڤالەکی بهنێرە.

# ناڤەرۆك